

# چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی کۆیە



مام هەژار

2011

✓ ناوی کتێب: چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی کۆیە
✓ نوسینی: مام هەژار
✓ تیراژ: ٥٠٠ دانە
✓ سالی چاپ: ٢٠١٠
✓ دیزاین: سەنتەری لێکۆڵینەوە و پەخشی کۆیە

چاپ کردنی
کۆمەڵگەی چاپەمەنی شەهاب – هەولێر

لەسەر ئەرکی سەنتەری لێکۆڵینەوە و پەخشی کۆیە چاپ کراوە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە سپاردنی (٥١٩) سالی ٢٠١١ ی پێدراوە

**پێشکەشە بە :**

**گیانی پاکی باوکم و دایکم.**

**حاجی و دڵداری نەمر.**

# پێشەکی

ئەم کتێبە کۆمەڵێك ووتاری نوسەرێکە کە زۆر بە سەلیقەو وردەکارییەوە وەك باس‌و لێکۆڵینەوەی لەسەر شاری کۆیەو بە تایبەتی لە سەدەی رابردوو نوسیوەو باسەکان هەمەلایەنە لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی‌و ئابوری‌و شارستانی‌و کەلتوری‌و فەرهەنگی کۆیە نوسراون‌و بونەتە بڕوانامەی زۆر چاك‌و پوخت بۆ هەرکەسێك بێت خەریکی دیراسەتی راستی مێژووی ئەم شارە بێت وە رووە شارستانیەکەی تێدا نیشان کراوە.

گەر بە ووردی بە باسەکاندا بڕۆیت دەسەلمێندرێ کە کۆیە بنکەیەکی شارستانی کوردستان بووە وە رەسەنایەتی تایبەتی خۆی هەیە دەوری لە گەشەکردن‌و پێشکەوتنی کوردستان بووە لە رووی زانست‌و ئەدەب‌و هونەری گۆرانی‌و مۆسیقا ئاوێتە بوونێکی شارستانی تێدا خولقاوە.. هەر ئەوەش وای کردووە کە خۆڕاگر بێت لەبەردەمی زریانی زەمانەی ناحەزانی‌و هەڵگری مەشخەڵی کوردایەتی‌و سیاسەت‌و پێشکەوتن خوازی بێت.

دەست خۆشی لە مام هەژاری نوسەر دەکەین کە بەڕاستی باسەکانی بە پێزو دەوڵەمەندن وە ئەم هەوڵە زۆرمەسەلەو روداوی مێژووی پاراستووە پێش ئەوەی بچێتە دنیای لەبیرچوونەوەو فەوتان بە تێپەڕبوونی زەمان‌و نەمانی ئەوانەی لە بیریان بووە.. دیارەو ئاشکرایە سەنتەری لێکۆڵینەوەو پەخشی کۆیە کاری سەرەکی ئەم جۆرە باسانەیە.. بۆیە بە سوپاسەوە بڕیارماندا ئەم کتێبە چاپ بکەین، ئومێدوارین کاکە هەژار بەرهەمی بە بریشت‌و دەوڵەمەندیتر ببەخشێتە گەلەکەی..

خوا چەپارەمان بدات لەسەر خزمەتی نەتەوەکەمان‌و شارەکەمان..

**صلاح شێخ شرف**

لێپرسراوی سەنتەری لێکۆڵینەوەو پەخشی

کۆیە

## جولەكەكانی كوردستان

### چەند تابلۆیەكی خەماوی لە مێژوویێكی دوور

پێشكەشە بەو جولەكە كوردەی كە دوای نیو سەدە دابڕان لە زێدی خۆی شنەی ئازادی كوردستان هێنایەوە سەر خانووە شەقو شڕەكەی جارانیو لەبەردەم میحرابەكەیدا خاكو خۆڵەكەی ماچكرد..

رۆژهەڵات لانكەی سەرهەڵدانی ئاینەكانە.. بۆیە دەبینین رۆژهەڵاتیەكان لەسەر یەك ئایین نین.. تەنانەت لە ناو ئاینێكیشدا چەندین ئاینزاو لێكدانەوەی جۆر بە جۆر بەدی دەكرێت.. ئایینی جولەكە یەكێكە لە ئایینە هەرە كۆنەكانە.

گەلی جولەكە بە درێژایی مێژوو ڕوو بە ڕووی چەندین كارەساتو نەهامەتی هاتووە.. مەگەر مێژووی گەلی كورد، ئەگینا مێژووی هیچ گەلێكیتر بە قەد مێژووی ئەوان خوێناوی نییە.. لە سەرەتادا گەلی جولەكە نەیانتوانی دەوڵەتێكی یەكگرتوو دابمەزرێنن، ئەوان لە چەندین هۆزو تیرە پێكهاتوون.. هیچ سەرۆك خێلێك ملی بۆ ئەوانیتر كەچ نەدەكرد، بەڵام لە ئەنجامی مەترسی دەرەكی. هەر دوانزە تیرەكەیان لە ساڵی(١٠٢٥) شائولی كوڕە جوتیاریان بە سەرۆكی یەكەم دەوڵەتی خۆیان هەڵبژارد.

لە سەدەی حەوتەمی(پ. ز) ئاشوریەكان پەلاماری خاكی(كەنان) یان داو سەدان جولەكەیان قەتلو عام كرد.. هەزارانیشیان بە دیل

گرتو دەربەدەریان کردن.. تەورات بەم شێوەیە باس لە جوەکان دەکات ( لە سەدەی حەوتەم.. پاشای ئاشوور سامیرەی گرت، ئیسرائیلیەکانی بۆ ئاشور راگواست، لە هەلاو سەرو خابوورو روباری گوزانو چیاکانی میدیا نیشتەجێی کردن).

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە، کتێبێك بە ناونیشانی(دەوڵەتی جولەکە) لە لایەن دکتۆرێکی جولەکەی شاری ڤییەننا بە ناوی(تیۆدۆر هیرتزل) نووسرا.. ئەم کتێبە تا هەنوکە بە تەوراتی دووەمی بزوتنەوەی زایۆنی دەژمێردرێت.. (هیرتزلو حاییم وایزمن) رۆڵی گرنگیان لە دامەزراندنی دەوڵەتی جولەکە بینی.

لە ساڵی(١٩٤٨) جولەکەکانی هەموو عێراق بە کوردستانیشەوە لە کۆچێکی بە کۆمەڵدا، تا ساڵی(١٩٥١) نزیکەی(٦٥٨) هەزار کەسیان بەرەو ئیسرائیل خاکی بەڵێن پێدراو( أرض المیعاد) کۆچ پێکرد.

# گەلێكی زیندوو

بەشی هەرە زۆری جولەكەكانی كوردستان نیشتەجێی شارەكانی زاخۆو ئامێدیو ئاكرێو دهۆكو هەولێرو سلێمانی بوون.. جگە لەوە ژمارەیەكیشیان لە شارۆچكەو گوندەكانی كوردستان بڵاو بونەوە..

كۆیە یەكێكە لەو شارانەی هەر لە زووەوە كەمینەیەكی ئایینی جولەكەی تێدا ژیاوە.. ئەوان بە زۆری لە كۆنە قەڵاتی گەڕەكی هەواو بوون، هەر لەوێش(كەنیشتە)یان هەبوو، پێش سەدو پەنجا ساڵێكیش لەمەوبەر، چەند ماڵێكیان گواستەوە گەڕەكی بەفری قەندی دەوروپشتی مزگەوتی(حەتكو گەرموك).. پێیان دەگوت گەڕەكی جولەكان، بە هەمان شێوە لەوێش(كەنیشتە)یان هەبوو.

زمانی جولەكەكان زاراوەیەكی رۆژهەڵاتی ئارامیە.. واتا بە هەمان زمانی ئاشوریو كلدانی دەدوان، جگە لەوزەمانە جولەكەكان زمانی كوردیشیان زانیوە، بەڵام هەرگیز لە بۆتەی فەرهەنگی كوردیدا نەتوانەتەوە.. بە دەگمەن نەبێ ئەگێنا هیچ جولەكەیەك خاوەنی زەویو زار نەبووە، ئەوان هەمیشە خۆیان بە میوان زانیوە، چونكە ئاینەكەیان بەڵێنی گەڕانەوەی خاكی ئیسرائیلی پێداون.

جولەكە لە سەر ئاستی دونیادا بە زیرەكو دەست رەنگین ناسراون.. دەیان(زاناو فەیلەسوفو بیریار)یان لێ هەڵكەوتووە، لە كوردستانیش

ئیش‌و کاری زەڕەنگەری‌و دارتاشی‌و خەمچێتی‌و وەستای خانوو بەرەیان قۆرخکردبوو.. هەر بە هۆی شارەزایی‌و دڵسۆزیان لە کارەکانیاندا هەمیشە بازاڕیان لە هەڕمێن دابوو.. جگە لەو کارانەی سەرەوە بازرگانی توتن‌و خوری‌و مازوو و کەتیرەو وەنەوشە لە نێوان کۆیەو شارەکانی وەك..(موسل‌و بەغدا) لە لایەن ئەوانەوە دەکرا.. پێم وایە ئەو سەردەمەی کە کۆیە ناوەندێکی بازرگانی مەزن بووە لە ناوچەکە، هۆیەکەی بۆ چوست‌و چالاکی ئەو دوکاندارو بازرگانە جولەکانە دەگەڕێتەوە.

جولەکەکان لە نێوان خۆیاندا زۆر کۆك‌و تەبا بوون.. حەسودیان بە یەکتر نەبردوە، دەستی یارمەتیان بۆ یەکتر درێژ کردووە.. نەمان بیستووە خیانەت لە یەکتر بکەن، لەگەڵ ئەوەی دەوڵەتی ئیسرائیل لە جولەکەی زیاتر لە(١٥٠) وڵات پێکهاتووەو بە(٨٥) زمان‌و زاراوەی جیا جیا دەدوێن، لەگەڵ ئەوەش دا بە یەکێك لە وڵاتە هەرە بەهێزو پتەوەکانی ئەم جیهانە دێنە ئەژمار.. پێدەچێ پەیوەندی جولەکەکان لەگەڵ هەر یەك لە موسڵمان‌و دیانەکان باش نەبووبێت، بە شێوەیەکی گشتی، بە هۆی ئەو دەمار گیریە ئاینیەی موسڵمانانەوە بە چاوی سووك‌و نا دۆستانە سەیر دەکران، لە هەندێ شوێن توندو تیژیان بەرامبەر کراوە، هەتا دوێنێ هەندێ دەستەواژەو دەربڕینی ئەو زەمانە لە ئارادابوو، کە باسی لە پێگەی جووەکان دەکرد.. وەکوو (هێندەی جوێك لێی پاڕامەوە)

یا خود (دەڵێی جولەکەیە) یا خود (لە ناو جوان بخۆو لە ناو دیاان بخەوە).

جلو بەرگی ژنو پیاوی جوو، هەرگیز لەگەڵ پۆشاکی کوردەواری ئەو سەردەمە جیاوازی نەبوو.. ژیانیان خۆشو شارستانیانە بوو، پاكو خاوێنو رەوشتیان بەرز بوون.. لە گۆشت فرۆشە موسڵمانەکان گۆشتیان نەکڕیوە، بەڵکوو(مالم) خۆی سەرپەرشتی کوشتاری کردووە.. بواری کوشتاری نەخۆشو بریینداری نەداوە..(موشیو ئیسحاقو نەسیم) لە ماڵە جووەکانی ساڵانی چلەکانی کۆیە بوون.

لە کاتی مردنی یەکێکیان خواردنی ساڵێکی مردووەکە دەدرایە ماڵە هەژارێکی خۆیان.. جووەکان بە گشتی ژمارەیەك جەژنو بۆنەی جیا جیایان هەبوو وەکو، جەژنەکانی نەورۆزو فەتیرەو سەللی حوتیو کەپرەشینە.. جەژنی کەپرە شینە یەکێك بوو لە جەژنە بایەخدارەکانیان، لەم جەژنەدا کەپرێکیان دروست دەکردو بە مورتك رازاندویانەتەوە، جۆرها میوەی وەرزی پاییزیان پێدا شۆڕ کردۆتەوەو خواردنو خواردنەوەیان ئامادە کردووە، ئەو کەپرەشیان تا یەکەم بارانی پاییز هێشتۆتەوە.. لای ئێمەو مانیش بە هەوڵ بارانی پاییزان دەڵێن..(کەپرەشینە) کەواتا بارانی پەرە ئەم رێو رەسمە بە بۆنەی رزگار بوونی حەزرەتی (موسا)یە لە دەستی فیرعەونو خۆشاردنەوەی لە ناو مورتکان.

# وەرزێکی تووڕە

چەند برینێکی بە سوێیە، خەمێکی تاڵو قورسە، کەسێك هەموو تەمەنی خۆیو بابو باپیرانی بە خۆشیو خەمەکانییەوە، ڕەنجو عارەقەو ئەوینی لەگەڵ بۆنی خاکێك ئاوێتە بووبێ لە چرکەیەکدا هەموو هیواو خۆزگەکانت، یادەوەریو خەونەکانت بخەنە کۆڵو راپێچت کەن، بەرەو کۆچێکی سوورو یەکجارەکی.

بەشێکی زۆری جولەکەکانی کوردستان، کە خۆیان لە(٣٠-٤٠) هەزار کەسێك دەدا.. لە ساڵی(١٩٤٩) تا ساڵی(١٩٥١) بە چەندین کۆچی بە کۆمەڵ بەرەو ئیسرائیل کۆچیان کرد، جگە لەو جولەکانەی کە بە هۆی ژنو ژنخوازیەوە مانەوە، یا خود ئەوانەی بڕوایان بە ئیسلام هێنا.. تا ئەمڕۆش بەم خەڵکانە دەڵێن(بن جوو).. جووەکانیتر هەموویان لە ڕێگەی تورکیا، یا خود لە ڕێگەی ئێرانەوە بە یەکجاری کوردستانیان بەجێهێشت.. بە ڕۆیشتنی جووەکان بۆشاییەکی گەورە لە چالاکیەکانی ئابوریو کۆمەڵایەتیو بازرگانیو هونەری لە کوردستانی عێراق دروست بوو..

ئیبراهیم پاشای بابان کاتێ بناغەی سلێمانی داناوەو لە قەلاچوالانەوە هاتۆتە ئەوێ.. بۆ ڕێکخستنو گەشەکردنی ئەمارەتەکەی دەیانو سەدان خێزانی جولەکەی لە ناوچەی قەرەداغەوە هێنایە

سلێمانی، چونکە دەیزانی جولەکەکان لە بواری بازرگانیدا زۆر شارەزاو زیرەکن.. لە کاتی کۆچکردنیان هەرچی زێڕو زیوو موڵکو سامانیان هەبوو هەرزان فرۆشیان کرد، دەسەڵاتداران دەستیان بەسەر زۆربەی پێداویستیەکانیاندا گرت.. لە گەرمەی ئەو دەست بەسەراگرتن‌و هەرزان فرۆشیەدا، بە ئیسلامەکانیان گوتووە: ئەمڕۆ ئێوە ماڵی ئێمە بە تالآن دەبەن، دەبێ سبەی کێ ماڵو حاڵی ئێوە ببات؟ ئێستا هەموو ئەوجوە کوردانەی لە کوردستانەوە کۆچیان بۆ ئیسرائیل کرد، کە خۆیان لە(٣٠) هەزار کەس دەدا، لە چەندین ئۆردوگا(مستوطنات) دا دەژین، لە کاتی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکاندا تاوریان لێدەدرێتەوە.. بەشی هەرە زۆریان دابو نەریتی کوردەوارییان پاراستووە.. لە هەندێ ماڵەکاندا گوێ لە گۆرانی‌و موزیکی کوردی دەگرن و لەناو خۆشیاندا بەهەمان شێوازی جاران دەدوێن، لەدوای راپەرینیش ژمارەیەکیان بەسەردان گەرانەوە کوردستان.

# تێڕوانینێکی خێرا لە ستاتیکی مۆسیقا

زانیاریـەکانی مـرۆڤ دەربـارەی مۆسـیقا بـۆ نوسـینی فەیلەسـوفە یۆنانیەکان دەگەڕێتـەوە، ئەگـەر چـی لـەو نوسـینانەدا ڕەسـەنایەتیو میتۆدی زانستی کەمتر بەدی دەکرێ.. لەگەڵ ئەوەش ئەم نوسـینانە بـە سەرەتایەکی چاکو سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند دەژمێردرێت بۆ کەسانێك، کە بیانەوێ لێکۆڵینەوەو شارەزایی لەو بوارەدا بە دەست بێنن.

کاهینو پیـاوە ئاینیـەکانی میـسر، هـەمان بـڕوای یۆنانیـەکانیان هەبووە، جگە لەوە ئەو تەرزە بیرو بۆچونە لە ڕۆژهەلاتیش هەبووە.. بەلام چاکەی یۆنانیەکان لەوەدا بووە، کە تیورەکانی مۆسـیقای پـێش خۆیـان ڕێکخستووە..لەو سەردەمەدا بە شێوەیەکی نیمچە ئەفـسانەیی سـەیری مۆسیقا دەکرا بەو پێیەی مۆسیقا جۆرە هونەرێکە خوای جوانی(موزی) دایهێناوە.

هۆمیرۆس لە ئۆدیسەدا دەڵێ:

((گۆرانی بێژەکان نزیکترین کەسن لە دڵو دەروونی خوداوەنـدەکان، خوا بەهرەی دەنگ خۆشی پێبەخشیون، نەك بەتـەنها بـۆ ئـەوەی دڵـی خەڵکی پێ خـۆش بکـەن، بـەڵکو بـۆ گـۆڕینو چـاککردنی ڕەوشـتی خەڵکیش )) گۆرانیو مۆسیقا وەکو هەموو بابەتەکانی دیکەی هونـەر لەسەردەمی ئەفلاتوندا گەشەی کردبوو، چونکە ئەو لەهەموو کەسـێك

زیاتر درکی بەرۆڵی کۆمەلأیەتی ئەو ژانرە کردبوو، بۆیە وەزیفەیەکی ئەخلاقیشی خستبووە ئەستۆی هونەرمەندان، وەکو لەهەندێ سەرچاوە مێژوویەکانەوە هاتووە، لەهەندێ هەرێم و ناوچەی یۆنان، یاسای بەزۆر فێرکردنی مۆسیقا تا تەمەنی (٣٠) ساڵ هاولأتیانی دەگرتەوە .. ئەفلاتوون سەرەرای ئەوەی خزمەتێکی گەورەی بە ئەبستمۆلۆجیای مرۆڤایەتی کرد، لەهەمان کاتدا هەوڵو نووسینەکانی بۆ پێشخستنی هونەر، چی لەو کەمتر نەبووە، بۆیە لەهەر نووسین و توێژینەوەیەکی فەلسەفەی ( جوان ناسی/ ستاتیك ) ، بەوپەری بایەخەوە سەیری هەوڵەکانی ئەو مرۆڤە مەزنە دەکرێ ، پەیدابوون و ئەرکی کۆمەلأیەتی مۆسیقا و گۆرانی لەگەڵ پەیدابوونی مرۆڤ سەریان هەڵداوە . سەرەتا لە ئامێزی سروشتەوە نەشونمای کردووە و تەعبیری لەترس و سەرسورمان و هەڵچونەکانی مرۆڤ کردووە، هەروەکو چۆن شارستانیەت ، بەهەوڵ و رەنجی هەموو گەلانی دونیا هاتۆتە دی، هونەریش بەگشتی بەری رەنجی هەموو میللەتانی دنیایە، هەرنەتەوەیەك بەپێی گونجانی باری ئابووری و فەرهەنگی و کۆمەلأیەتی خۆی، کەم تا زۆر لەو بوارە مێژووییەدا بەشداری کردووە .دیالۆگ و نزیکبونەوەی شارستانیەتە جۆراوجۆرەکان، نۆتەی مۆسیقای هێناکایەوە، داهێنانی چەندین ئامێری مۆسیقی وەك قانون و گیتار و عوود و سازی لێکەوتەوە.. کەنیسەی مەسیحی چەندین ئامێری تری وەك ئۆرگ و پیانۆی هێنابەرهەم . مێژوو نووس و

زانایان پێیان وایە ، تێکرای گەلان مۆسیقایان لا پیرۆز بووە.. هەموو ئایینەکانیش سروودو ئاوازیان لەپەرستگاوە بۆ خواوەندەکان داناوە .

مۆسیقا وەکو ( وایت وایتمان ) باسی لێوەکردووە، ئەوەیە کە ئامێرەکان لەناختا بەئاگای دێنن، مۆسیقا تاقیکردنەوەی ژیانی رۆژانەی خەڵکە، سەدای هیواو ململانێی ئازارەکانی مرۆڤە، بەراستی هونەرێکی سیحر ئامێزە، توانای شۆربوونەوەی ناو قووڵایی جەستەو دەروونی مرۆڤی هەیە، تەنانەت دەسەڵاتیشی بەسەریا دەشکێ، ئاوازێکە لەچوارچێوەیەکی گونجاو و بەپێی کێشێکی دیاریکراو دارێژراوە، کە هەموو هەست و سۆزی تێدا بەرجەستە دەبێ، وەکو بن جۆسۆن دەڵێ : هونەر دوژمنێکی هەیە ئەویش نەزانینە، ئەو پەیڤە پرشنگدارە زیاتر لەسەر هونەری مۆسیقا پراکتیزە دەکرێ وەك، لە بوارەکانی تری هونەرە جوانەکاندا، چونکە ئەو هەست بەخۆشی کردن و چێژو کارلێکە سایکۆلۆجیەی تریەکانی مۆسیقا لە دڵ و دەروندا جێی دێڵن هیچ جۆرە هونەرێکی تر، ئەوخۆشی، جوانیەمان پێنابەخشن.. هەر ئەو هەستو سۆزە خاوێنەیە وای لەفەیلەسوفو پیاوانی ئایینی و سیاسەتمەداران کردووە، بەگومان و نیگەرانیەوە سەیری رۆڵی مۆسیقاو داهێنەرانی بکەن .

# چاڵە بەفرەکانی کۆیە

هەموو شتێك لەم جیهانە لە گۆڕان دایەی‌و دەجوڵێ‌و بەرو پێش دەچێ.. تاقیکردنەوەی رۆژانەو پێشکەوتنی زانست‌و دیالکتێکی مێژوو ئەوەمان بۆ دەردەخەن، کە هیچ شتێك‌و دیاردەیەك بەدەر نییە لە یاساکانی گۆڕان‌و گەشەسەندن.. با هۆزی ئەم پێشکەوتنە بە تایبەتی لەم سەدەیەی دواییدا هەژمورنی بەسەر هەموو گۆشەو کەنارێکی ئەم جیهانەدا هەبووە.

بە شێوەیەك ئەمڕۆ جیهان بۆتە گوندێکی بچووك بە هۆی تەکنەلۆجیاو ئامێرەکانی پەیوەندی کردنەوە.. بێگومان ئەم گۆڕانکاری‌و ئاڵوگۆڕانە کەم تا زۆر هەموو کۆمەڵگەکانی گرتۆتەوە.. جا ئەو کۆمەڵگەیە لە جەنگەڵستانی ئەفریقیا یا خود لە دۆڵەکانی(هیمالایا) بێت..! گەر لاپەڕەکانی مێژووی ئەم شارۆچکەیە هەڵبدەینەوە، یا خود گوێ بۆ خەڵکانی بەساڵا چوو شل بکەین.. بەراوردیان بکەین لەگەڵ واقیعی ئێستای کۆیە هیچ گومانێکمان لا نامێنێ کە گۆڕان‌و پێشکەوتنیکی ئاسۆیی‌و ستونی هەموو شارەکەی گرتۆتەوە.. بە تایبەتی لە ماوەی حوکمڕانی خۆماڵیدا.. پێش ئەوەی ووزەی کارەبا بگاتە ئەم شارە دانیشتووانەکەی تەنها ئاوی کانیاوەکانی حەمامۆکیان بۆ خواردنەوە بەکار دەهێنا، هەڵبەتە ئەم ئاوەش وەکو

ئاوی كانیاوەكانی كوێستان ساردو زوڵاڵ نەبوون، بۆیە دانیشتووانی كۆیە بیریان لەوە كردووە.. كە زستانان بەفری چیاكان لە چاڵان گڵ بدەنەوە تا وەرزی گەرما بیپارێزن.. ئەم كۆكردنەوەی بەفری زستانان گۆشەیەكی بچووكی ژیانی شارەكە پێكدێنێ، با بەیەكەوە زوومی چاومان بخەینە سەر تابلۆیەكی بە رەنجو ئارەقە نەخشێنراوی سەردەمێكی زووی كۆیە.

# پێش بەفر بارین

لە وەرزی پاییزەوە خاوەنی چاڵە بەفرەکان سەرقاڵی خاوێن کردنەوەو ئاوەدانکردنەوەی چاڵەکان دەبوون.. هەر کە بەفر دەباری ئیتر ئەوە وەکوو سعاتی سفر وابوو بۆ خاوەنی چاڵە بەفرەکان بۆ دەست بەکاربوون.

سەرەتا لە ناو شار بانگەوازیان بڵاو دەکردەوە بۆ بەکرێگرتنی کرێکار، وەکوو زانراویشە هەر چاڵە بەفرێك پێویستی بە سی تا چل کرێکار هەبووە.. جگە لەوە نانی نیوەڕۆیان کە پێکهاتبوو لە نان‌و دۆشاوو خورما لەسەر خاوەن کار بوو.. هەندێك لەو چاڵە بەفرانە تاکوو ئەم رۆژگارەش نیشانەیان بەسەر لوتکەو سنگی باواجی هەر دیارن، کە دەکەونە رووکاری ئەو دیوی چیاوە.. واتا دەڕواننە ناوچەی دڵڕفێنی خۆشناوەتی چونکە ئەم رووکارە بە درێژایی رۆژانی وەرزی زستان کەمتر هەتاو دەیگرێتەوە... بەناوبانگترین خاوەن چاڵە بەفرەکان ئەمانەی خوارەوە بوون:

١- حەماغای کۆیە.

٢- صالح ئاغای ئۆمەر ئاغا.

٣- رەفیق ئاغا.

٤- ئەسعەد حاجی محێدین.

٥- مستەفا خدر باوەکری.

٦- رەزای مام یەحیا.

وەکوو دەگێڕنەوە بەفری(صالح ئاغا) لە هەمووان زیاتر هەرمێنی لەسەر بووە، چونکە بەفرەکەی لە کار کۆت خاوێن دەکردەوە.. کرێی رۆژانەی کرێکارەکانیش وەکوو یەك نەبوو، ئەو کارگەرەی بە بێڵ بەفری دەخستە ناو چاڵەوە رۆژانەکەی سی تا چل فلس بوو.. وەلێ ئەوانەی بەفریان بە کۆڵ دەکێشایە ناو چاڵەوە رۆژانەیان پەنجا فلس بوو، جگە لەو کرێکارانەی بە بێڵو بە کۆڵ بەفریان دەخستە ناو چاڵەوە هەمیشە هەشت تا دە کرێکار بەفری ناو چاڵەکەیان دەپەستایەوە.. گەر بەفر زۆر بباریبوایە چاڵەکە بە دوو رۆژ تەژی دەبوو بەفر کەم بباریبوایە ئەوا بە سێ رۆژ پڕ دەبۆوە. دوای ئەوەی چاڵەکە پڕ دەبوو لە بەفرو دەپەسترایەوە، ئینجا نۆرەی داپۆشینی دەهات.. سەرەتا سێ تا چوار تەنەکە خوورێیان لەسەر بەفرەکە بڵاو دەکردەوە.. پاشان چینێك چرۆیان لەسەر رادەخست، لەسەرەوەش بە ئەستورایی نیو مەتر بە خۆڵ دادەپۆشرا بۆ ئەوەی هەناسە نەداتو ببێتە هۆی تواندنەوەی بەفرەکە.. بەلای خوارەوەی چاڵەکەوە جۆگەیەکی باریك دروست دەکرا تا ئەو بەفراوەی لە چاڵەکە دەهاتە خوارەوە شۆڕببێتەوە.. ئەمەش کاروانچیو راوچییەکان سوودیان لێدەبینی.

# بەفری سپیو سارد بۆ رۆژی گەرم

زۆربەمان لەسەر ئەوە یەك دەنگین کە بەفری سروشتی تەندروست ترە لە سەهۆڵی کارگەکانو بەفری ناو سەلاجەکانی ماڵان.. لەگەڵ دەست پێکردنی وەرزی گەرما، خاوەن چاڵە بەفرەکان لەگەڵ بانگی بەیاندا دەبور لەسەر چیا بونایە بۆ ئەوەی بەفرەکە بە فێنکی بگەیەننە شار.. دوای ئەوەی خۆڵو چرۆی سەر چاڵەکانیان لادەدا، لە لای خوارەوەی چاڵەکە بە مشار بەفرەکەیان لەسەرشێوەی قالبی بەفرەکانی کارگەی ئەمرۆدەبریەوە ، ئینجا دەیان گواستەوە سەرپشتی ولآغان ، کەهەر یەکێکیان چوار قالبی لێبار دەکرا، دوای ئەوەی چاڵەکانیان دادەپۆشیەوە کاروانی ولآغان بەرەو شار شۆر دەبۆوە، خەڵکیش کە دەیانزانی بەفر گەیشتۆتە بازار ، هەریەکە بەپێی پێویستی خۆی بایی فلسێك تا عانەیەك بەفریان دەکری و دەیانبردەوە ماڵ . لەماڵەوەش ئەو بەفرە خاوێن و جوانەیان بەکار دەهێنا لەناو دۆو ماستاو شەربەتی مێوژ وهەناری بێفێڵەوە... جگە لە دانیشتوانی کۆیە کە لەو سەردەمەدا بەژمارە کەم بوون ، چونکە هەر لە چوار گەرەکە کۆنەکەی کۆیە پێکهاتبوو، خەڵکی دێهاتەکانی فەقێیان و کێلەخوارەو تۆبزاوا و هەرمۆتە و شیلەش ئەو بەفرەیان دەکری . دروستکردنی سەهۆڵ لەوچاڵە بەفرانەدا ماوەیەکی دوور و درێژی خایاند ، تا ئەو رۆژەی بەهۆی کارەباوە کارگەی سەهۆڵ ، یاخود لەرێگەی سەلاجەی ماڵانەوە بەفری دەستکرد پەیدا بوو ، ئیدی وردە وردە ئەو دیاردە جوانە پاشەکشەی کرد لەبەردەم جیهانگیری و تەکنەلۆجیادا خۆی رانەگرت و نەما .

## سەرنج

## چەند قسەیەك لەسەر وانەی تایبەتی

هەرکەسێك سەرنجی دابێ لەپرۆسەی پەروەردە و فێرکردن لەهەرێمی کوردستان بەتایبەتی لەم چەند ساڵەی دوایدا، بەبێ سێ و دوو کۆمەڵێك رووداو و دیاردەی نێگەتیڤ لەبەر دەمیدا راست دەبنەوە ،لەپێش هەموویانەوە دابەزینی ئاستی زانستی مامۆستایان و خوێندکاران و شێواندنی شێوازەکانی پرۆگرام و کایەکانی پەروەردە و بڵاوبونەوەی ( قۆپیە ) کردن لەناو خوێندکاراندا بەشێوازی جۆراوجۆر و تەشەنەکردنی پەتای ( وانەی تایبەتی ) . ئەوەی من لێرەدا مەبەستمە دیاردەی ( وانەی تایبەتی ) یە ، چونکە هەر بە تەنیا پەیوەندی بەخوێندکارانەوە نییە ، بەڵکو سەرئێشەیەکی گەورەشی بۆ کەس وکاریان دروستکردووە ،جاران وانەی تایبەتی هەبوو ، بەڵام نەك وەکو ئەوەی کە ئێستا هەیەو بارگرانیەکی قورسی خستۆتە ئەستۆی ژمارەیەکی زۆر لەو خێزانانەی کە منداڵەکانیان وانەی تایبەتیان پێ دەوترێتەوە . ئێستا وانەی تایبەت بۆتە لاساییکردنەوەو دروست بوونی تەنگژەی ئابووری لەناو خێزانەکاندا کەلە بنەرەتدا ئەو خێزانانە بەدەست دەردی نەبوونیەوە دەناڵێنن . پشووی هاوین بۆ ئەوەیە خوێندکار لەو وەرزەدا بحەسێتەوە دوای ئەوەی ساڵێکی پڕ لە کۆشش و

ماندوویەتی بەرێدەکات و نەك لەو گەرمایەداو بێ حەسانەوە بچێتە ناو سالێکی نوێی خوێندنەوە . بەداخەوە ئێستا ئەو ( وانە تایبەتیانە ) بۆ هەندێ لەو مامۆستایانە بووتە کاریکی بازرگانی ، تەنانەت رێگەیەکیش بۆ خۆ دەوڵەمەند کردن لەسەر حسابی توێژی خوێندکاران، کە خوێندکار خۆی مشەخۆرە لەسەر خێزانەکان ، بەداخەوە ئێستا هەندێ لەو مامۆستایانەی وانەی تایبەت دەڵێنەوە بەشانازیەوە باس لەوە دەکەن ، کەبەو پارەیە سەیارەیان کریوە ، من ئەمساڵ منداڵێکم لەپۆلی شەش دەخوێنێ ، داوای ئەوەم لێدەکات مامۆستای تایبەتی لە ( سێ ) وانە بۆ بگرم ، واتە دەبێ (٩٠٠) هەزار دینار بۆ ئەو سێ وانەیە پەیدا بکەم ، بۆ زانیاریتان هەندێ لەو مامۆستایانە ، گوایە پسپۆرترن لەچاو مامۆستای تر ، داوای (٥٠٠) هەزار دینار دەکەن بۆ هەر وانەیەك ، جاوەرە فەرمانبەرێکی نەگبەت چۆن دەتوانێ ئەو برە پارەیە پەیدا بکات؟ . بۆیە لێرەدا کۆتایی بەسەرنج و تێبینیەکانم دەهێنم . بەو ئومێدەی وەزارەتی پەروەردە بریارێك دەربکات بۆ نەهێشتنی ئەم دیاردەیە .

## جوانی وهەڵوێست لەتیپی هونەری چەوساوەکان

ئەوکاتـەی شۆڕشـی نـوێی گەلەکـەمان بەرابەرایـەتی یـەکێتی نیشتمانی کوردستان هەلگیرسا، هـەر بەتـەنیا شۆڕشـێکی چـەکداری نـەبوو ، کـە دروشمـی بەدەسـتهێنانی هەنـدێ ئامـانجی کـوردی بـەرز کردبێتەوە ، بەڵکو ئـەو بزوتنەوەیـە لـە ڕووی جیهـان بینـی و ڕێبـازو ئامانجـەوە جیـاوازی لەگـەڵ هـەموو راپـەرین و شۆڕشـەکانی تـری گەلەکەمان هەبوو ، لەهەمانکاتدا بنچینەی ڕێنسانسێکی نەتەوەیشی لەکۆمەڵگـەی کـوردەواری دارێـژا....! کاتێـك یەکـەم مانیفێـستی سەرهەڵدانی خـەباتی چـەکداری لەسـاڵی (١٩٧٦) بـلاو بـۆوە ، ئـەو پەیامە وەکو چرایەك وابوو ، کە شـەوی دەیجـوری کوردسـتانی روونـاك کردەوە ، سەرەرای ئەوەی دامەزراندنی ( ی.ن.ك) وەلامێکی لـۆژیکی و پڕبەپێستی رۆژگاری دوای هەرەس بوو ، قوتابخانەیەکی مەزنی هۆشـیار کردنەوەو پێگەیاندنی مرۆڤی کورد بوو بەباوەری پێـشکەوتن خـوازی و دیموکراسی ، ئـیتر پـەیتا پـەیتا خـەڵك رووە و باوەشـی گـەرمی چـیا سەرکەشـەکانی کوردسـتان رێگایـان گرتەبـەر . لەسـالأنی یەکـەمی شۆرشەوە دەیان هونەرمەنـد و رونـاکبیر و ئەنـدازیار و هتـد.. چـوونە ریزەکانی شۆرشەوە . هەریەك لەوانەش لە ئاستی خۆیان و لەو کـەش و هەوایـە ئازادیـەی شۆرشـدا بـە چـالاکی و نوسـینەکانیان گـولزاری شۆرشـیان رازاوەتـر کـرد . هـەمووشمان دەزانـین یـەکێتی نیـشتمانی

لەسەرەتای شۆرشەوە بایەخێکی گەورەی بەلایەنی هونەری و روناکبیری دابوو، لەسەردەمی خەباتی شاخدا تەنیا زمانی گوللە و ئاگر زال نەبوو، بەلکو بایەخێکی زۆریش بەلایەنی هزری دەدرا ، لەچاپخانەکانی شەهید جەعفەر و شەهید ئیبراهیم عەزۆدا خونچەی بەرهەمی دەیان نوسەر و ئەدیب گەشانەوە ... لە چیاکانی کوردستانەوە چەند تیپێکی موزیك چاویان هەلهێنا ، کەبە قورگ و پەنجەکانی دەستی ژمارەیەك هونەرمەندی بە هەلوێست ، گۆرانی و ئاواز و سرودەکانیان دەکردە دیاری بۆ جەماوەر و پێشمەرگە لە پێناو رامالینی پەیکەری دیکتاتۆریەت ... بەپێی ئەوەی لەو سالانەدا پێشمەرگەی تیپی (٩٣) ی کۆیە بووم ، سەرەرای ئەوە هاوکارێکی نزیکی تیپی هونەری چەوساوەکانیش بووم ، بۆیە لێرەدا بەپێی بیرەوەری و زانیاریەکانی خۆم تیشکێك دەخەمە سەر تیپی هونەری چەوساوەکانی سەربەتیپی (٩٣) ی کۆیە .

# تیپی (٩٣) ی گۆیه

یەکێك لە تیپە کاراکانی ( ی.ن.ك ) بوو ، کە رۆڵێکی گەورەی بینی لەبەر بەرەکانێی رژێمی بەعس . شەهید شەماڵ کە بووە لێپرسراوی ئەم تیپە ، سەرلەنوێ تیپەکەی بەشێوەیەکی رێکوپێك رێکخستەوە، رۆڵێکی گەورەی لەتوندوتۆلکردنی پەیوەندی هێزی پێشمەرگە بە جەماوەرەوە بینی . کاك شەماڵ جگە لەوەی کادیرێکی هەرە باشی بواری سەربازی و جەماوەری بوو ، هاوکات پیاوێکی هونەر دۆست و خۆشەویستی پێشمەرگەو جەماوەر بوو ، لەبەر ئەوە تیپی هونەری چەوساوەکان بەبێ هیچ گرفت و کۆسپێك چالاکیەکانی خۆی دەنواند .

# چۆن تیپەکە پێکهات ؟

لەسەرەتای ساڵی ١٩٨٢ دەستەیەك پێشمەرگەی هونەرمەندو هونەردۆست رێککەوتن لەسەر دامەزراندنی تیپێکی هونەری ( موزیك وشانۆ ) کاتێك بیرۆکەکەمان خستە پێش چاوی کاك شەماڵ ، زۆر بەسنگ فراوانی قبوڵی کردو بەڵێنی پشتیوانیکردنیشیدا . لێرەدا جێی خۆیەتی باسی ئەو راستیە بکەم ، کەلالۆ رەنجدەر بزوێنەری تیپەکەو هەوێنی زۆربەی بەرهەمەکانی بوو .لەراستیدا لالۆ کۆمەڵێك بەهرەی وەکو ، شیعر نوسین، وتاربێژی تێدابوو، کەجیای دەکردەوە لە دەوروبەرەکەی خۆی .... بەهۆی ئەوەی زۆربەی ئەندامانی تیپەکە هەڤاڵی کۆمەڵەی رەنجدەران بوون، بۆیە بەشی هەرە زۆری بەرهەمەکانی مۆرکێکی چینایەتی پێوە بوو، ئاشکرایە ئەو تیپە لە زروفێکی سەخت و دژواردا ئیشی دەکرد. هەرچەندە ستۆدیۆ و شانۆی نەبوو، بەلآم لە رووبەرێکی فراوانی خاکی کوردستان نمایشی شانۆیی پێشکەش دەکرد، چەندین بەرهەمی سروود و موزیکی تۆمار کرد لەبەر زروفی شەر و ململانێ ، پێشمەرگە هەمیشەلەجموجۆڵدا بوو بۆیە جار هەبووە کاری شانۆیی لەناو مزگەوتدا پێشکەش بە پێشمەرگە و جەماوەر کراوە، تەنانەت لەناو پاشکۆی ( عەرەبانەی ) تراکتۆر چالاکی کراوە، جارێکیان لە گوندی ( مێوژەی ) بناری کۆسرەت ، خەریکی تۆمار کردنی کاسێتێك بووین ، بەلآم لەبەر زەڕینی گوێدرێژ

و وەرپینــی ســەگ کارەکــەمان بــۆ تــەواو نــەکرا ... وەکــو لەبەراییــەوە ئاماژەمان پێدا، چالاکیەکانی تیپی هونەری چەوساوەکان لــە ســنووری تیپی (٩٣) ی کۆیە قەتیس نەکرابوو ، بەڵکو بەرهەمی هونەری خــۆی پێــشکەش بــە جوتیــاران و پێــشمەرگەکانی ناوچــەکانی مەرگــە و خۆشنارەتی و قەڵاسێوکە و ناوچەی جافایــەتی دەکــرد . ئاهەنگــەکانی گوندی چیوە و بۆگد و سەرگەڵو و شارستێن و بالیــسان لــە ئاهەنگــە سەرکەوتووەکانی ئەم تیپە بوون ، جێــی خۆیــەتی لێــرەدا یــەکێك لــە بیرەوەریەکانی ئاهەنگی جەژنی نــەورۆزی ســاڵی (١٩٨٣) بگێرمــەوە ، تیپی هونــەری چەوســاوەکان بــە بۆنــەی چــەژنی نــەورۆزەوە نمایــشێکی شانۆیی لە مزگەوتی گوندی ( چــیوە ) ســازدا، کــە ژمارەیــەکی زۆری پێشمەرگە و دانیشتوانی گوندەکە ئامادەی بوون، لە یــەکێك لەدیمەنــە کۆمیدیەکەی ئەو رۆژە ، بێژەری ئاهەنگەکە ( عریف الحفل )، هەڤاڵ ( هەڵۆ سەعید ) بوو . ( هــەڵۆ ) دەســتی بــە خوێندنــەوەی بەرنامــەی ئاهەنگەکە کرد، لەپڕ یــەکێك لــەناو قــەرەباڵغی ئــەو خەڵکــەوە، کــە هونەرمەند ( نەهرۆ سەلیم سەیدۆك ) بــوو ، بــەدەنگی بــەرز ویــستی قسەکانی ( هەڵۆ سەعید) بپچڕێنێ . ئەم بگرە و بەردەیە درێژەی کێشا ، یەکێك لە لێپرسراوانی پێشمەرگە چەندی کــرد کەشــی ئاهەنگەکــە هێمن کاتەوە بەڵام بێسوود بوو ، ( نــەهرۆ ) وازی نــەهێنا . ئــەوە بــوو چەند کەسـێك پــەلاماری ( نــەهرۆ ) یــان داو بــووە چــەك راکێــشان، بەشــێوەیەك هەرکەســە دەیویــست دەرپــەڕێ و خــۆی دەربــاز بکــات.

لەگەرمەی ئـەو مقـۆ مقۆیـە ( نـەهرۆ ) مەمۆڵەیـەکی خـستە زاری ( هەڵۆ ) وە و ئەملا و ئەولای یەکتریان مـاچ کـرد ئیـدی خەڵکەکـە لەئاست ئەم دیمەنەدا حەپەسان و بووە پێکەنین و خۆشی ....

## ئەندامانی تیپی هونەری چەوساوەکان

- لالۆ رەنجدەر .
- نەهرۆ سەلیم سەیدۆك .
- مشیر مستەفا ، شەهید بوو .
- جەعفەر حەمە دەروێش ، شەهید بوو .
- زرار مستەفا ، بێسەرو شوێنە .
- سەعید میرخان .
- سەفین عومەر .
- دلزار محمد.
- شۆرش حمید
- هەلۆ سەعید
- مەلا دلشاد
- محمد دارەوان .
- محمد رەنجە .
- سیار بامەرنی .
- هەژار حەمە صالح .

## دیاردەی حیجابو توندو تیژی دژ بە رەگەزی مێینە

پەچە یاخود نیقاب دیاردەیەکی باوی ئەمڕۆیە، کە ڕێژەیەکی زۆر لە ئافرەتان دەیپۆشن.. گومانیشی تێدا نییە پۆشینی حیجاب کەسایەتی ئافرەت لاواز دەکات.. ڕاڕاییو نیگەرانی لە دەروونیدا دەڕوێنێ.. هەستێکی ئەوتۆ لە لای دروست دەکات، کە خۆی لە خوار پیاوەوە ببینێ.. مرۆڤێك چەندین ساڵ لە بەندیخانەی حیجاب ژیانی بەسەربردبێ، هەرگیز ناتوانێ بە ئاسانی لە ئاسۆوارە نێگەتیڤەکانی دەرباز بێ.

کەسایەتی زادەی هەلو مەرجو ڕەوشێکی تایبەتی کۆمەڵگەیە بە تێکەڵاو بوونو کرانەوە پێدەگاتو بەهێز دەبێت.. بە لێکترازانو جیاکردنەوە لاواز دەبێت.. مرۆڤێك ناچار کرابێت دوورە پەرێزو لاتەریك بوبێ لە کۆمەڵو دەوروبەرەکەی، لە ئاکامدا ئەو مرۆڤە کەسایەتیەکی لاوازو ڕاڕای لێ دەردەچێت.. گەر بەراوردێك لە نێوانی ئافرەتی موحەجەبەو سفوربکەین دەبینین ئافرەتی سفور چەند ووریاو چوستو چالاكو هۆشیارە بەرامبەربەکۆمەڵو دەوروبەرەکەی.. لە بەرامبەر دا موحەجەبە هەمیشە شەرمنو ڕاڕایە.. سڵ لە دەوروبەرەکەی دەکاتەوە.. هەرچی نازو سیحری جوانیشی هەیە لە ژێر دێوە زمەی لەچك شاردویەتیەوە، جگە لەوە ئافرەتی موحەجەبە چونکە سەرقاڵی مەسەلە میسالیەکانە.. بۆیە زۆربەی جاران کزو ڕەنگ شێواو سیما تەڵخە...!

هەموومان دەزانین دیاردەی توندو تیژی دژ بە ئافرەتان تەنیا لە وڵاتی ئێمەدا پەیڕەو ناکرێت، بەڵکو دیاردەیەکی جیهانییە، بەڵام ئەوەی کۆمەڵگەی ئێمە لە کۆمەڵگەکانی دیکە جیا دەکاتەوە.. فراوانی دیاردەی توندو تیژی دژ بە ئافرەتان، هەر لە کوشتن‌و ئازاردانی ئافەرتانەوە تا دەگاتە سوکایەتی پێکردن‌و ئازار دانی دەروونی، کە لە لایەن کەس‌و کاری ئەو ئافرەتانەوە پەیڕەو دەکرێت.

جۆرەکانی توندو تیژی:-

- توندو تیژی جەستەیی(کوشتن‌و لێدان‌و لووت‌و گوێچکە بڕین.
- توندو تیژی ئابوری(بێبەش کردنی ئافرەت لە موڵك‌و پارەو وەرەسە هتد...).
- یاسای(هەڕەشەی ژن بەسەر داهێنان‌و تەڵاق دان‌و هتد...).
- توندو تیژی سایکۆلۆجی( ئازاردانی دەروونی‌و سوکایەتی پێکردن‌و هەڕەشەو چاو سوور کردنەوە).
- توندو تیژی سێکسی.

لەگەڵ ئەوەی توندو تیژی بە شێوەیەکی بەر فراوان ئەنجام دەدرێت دژی ئافەرتان بە تایبەتی لە لادێ‌و گەڕەکە میللیەکاندا.. بەڵام بەرپەرچدانەوەیەکی ئەوتۆی لێنەکەوتۆتەوە لە لایەن ئافرەتانەوە، ئەمەش بۆ کۆمەڵێك هۆکار دەگەڕێتەوە.. لەوانە:

- ئافرەتی کورد هەمیشە بە داب‌و نەریتی ملکەچی‌و گوێڕایەڵی‌و رازی بوون پەروەردە کراون.

- هەندێك لە ژنان پێیان وایە، ئەو توندو تیژییە كاریكی سروشتیو ئاساییە.
- لە پێناو بەرژەوەندی منداڵەكانیو ترسی جیابوونەوە.
- ترسی لە كۆمەڵو دەوروبەرەكەی خۆی هەیە.
- بڕوای بە یاساو دادگا نییە، پێیان وایە لە بەرژەوەندی پیاوان دان.
- بڕوای بە خۆی لاوازە، خۆی بە مرۆڤێكی بچووكتر لە پیاو دادەنێت.
- نیگەرانو ترساوە لە گەیشتنی كێشەكانی بۆ بەردەم دادگاو پۆلیس.

هەڵبەتە ئەنجامدانی كاری توندو تیژی بۆ كۆمەڵێك فاكتەری جۆراوجۆر دەگەڕێتەوە، لە پێش هەموویانەوە دواكەوتووی باری ئابوریو رۆشنبیریو كۆمەلایەتی.. هەروەها زاڵبوونی عەقلیەتی دەرەبەگایەتیو ئاینیو بلاوبوونەوەی دابو نەریتی كۆنەپەرستی.. لە بەرامبەر توندو تیژی دژی ئافرەتان.

توندو تیژی روێكی دیكەشی هەیە.. ئەویش توندو تیژی ژنانە بەرامبەر پیاوان، بەلام ئەم جۆرەیان حاڵەتێكی گشتی نییە، كە خۆی لە تورە بوونو رەقی بەرامبەر پیاوو رێز نەگرتنیو هتد... دەگرێتەوە.

# خوشكه فريشته

((ئاواته خوازم رێكخراوه پەرتەوازەكانی ژنان لـه یـەك رێكخـراوی سەرتاسەریدا ببینم))

﴿خوشكه فريشته﴾

پێم وا نییه كەسێك هەبێت لـه نـەوەی كـۆنی ئـەم شـاره خوشـكه فريشته نەناسێ.. چونكه ئەو به هۆی زیاتر له نیو سەده تێكۆشـان لـه بـواری رامیـاریو كۆمەلایـەتیو داكـۆكیكردن لـه بەدەسـت هێنـانی مافەكانی ژنان جێ پەنجەی لەسەر ئەم بوارانەدا بەجێهێشتووه.

له خێزانێكی رۆشنبیرو نیشتمان پەروەر چاوی به ژیـان هـەلێناوه، هەر له تەمەنی هەرزەكاریەوه تێكەلاوی جیهانی سیاسـەتو ئـەدەبیات بووه.. كه لـه ئەنجامـدا دەیـان سـالْ تەمـەنی خـۆی لـه گرتووخانـەو دەربەدەری بەسەر بردووه.. شیعرەكانیـشی كردۆتـه مـۆمی داگیرسـاوی رێگه تاريكو سەختەكانی ژنانی ستەم دیدەی گەلەكەی.

هەر لەبەر ئـەم چوسـتو چـالاكی و هۆشـیاریەی پێـی ناسـراوه ، لەسالّی (١٩٥٩) ئەو لەگەلّ كچێكی دیكەی كورد ، كەناوی ( ناجیـه خان ) ی خوشكی شەهیدی نەمر خالّه شـەهاب بـوو ، بەنوێنەرایـەتی ژنانی كورد بۆ كۆنگرەی دەیەمی جیهـان لـه كۆمـاری چـینی میللـی

هەڵبـژاردران . بـۆ زیـاتر ئاشـنابوون لــە هەنـدێك لایـەنی ئـەو ژنــە تێکۆشەرە، ئەم دیدارەمان لەگەڵ سازدا .

پرسیار/ باڵەسەرەتاوە بەم پرسیارە تەقلیدیـە دەسـت پێبکـەین لەقۆناغی منداڵیت چیت لەیاد ماوە ؟

و/ بەهۆی ئەوەی لەبنەماڵەیەکی روناکبیر چاوم هــەڵێناوە ، بۆیــە لەقۆناغێکی زووەوە تێکەڵاوی رۆژنامەو گۆڤــار و کتێــب بــووم ، بــەڵام نەمتوانیوە پلەکانی خوێندن بــبڕم ، چــونکە کــەش و هــەوای سیاســی خێزانەکەمان و بارو زرووفی سەختی ئەو رۆژگارەی کۆیە بواری پێنەدام بچمە قوتابخانە ، وەکو پێشتر ئاماژەم پێدا ، من لە فەزایەکی رۆشنبیری گــەورە بــووم ، کەئــەوە ئاســۆیەکی باشــی لەبــەر دەمــم کــردەوە بــۆ بەدەستهێنانی رۆشنبیریەکی گشتی ،ئیــدی لــەو رۆژەوە تیــشکی بــیری کوردایەتی مێشك و دڵمی روناك کردەوە ، تا دەگاتە ئەمرۆ کەتەمــەنم لەهەشتا ساڵی نزیك بۆتەوە ، بۆ ســاتێکیش دەســت بــەرداری کێــشەی رەوای گەلەکەم و خواســتەکانی ژنــان نەبوومەتــەوە لەســاڵی (١٩٥٢) لەگەڵ چــەند کــچێکی دیکــە داوایــەکمان دا بــەمیری بــۆ کردنــەوەی قوتابخانەی ئێواران ، زۆری پێنەچوو ئاواتەکەمان هاتەدی و قوتابخانــەی ئێواران کرایەوە . یەکەم جار نەوەدو پێنج کەس لە کچان و ژنانی کۆیە بەشداریان تێداکرد ، هەندێك لەبەشداربوان درێژەیان بە خوێنــدن داو بوون بە مامۆستا ، مامۆســتاکانیش ئەمانــە بــوون : ( ســت خانــەی حاجی سمایل ، ست زەکیە محمد و ست ناجیە )

پرسیار / چ ڕووداوێك کاریگەری زۆری بەسەرتەوە هەبوو ؟

و/ کاتێك کۆماری مهاباد دامەزرا ، لاوێکی گەرمی ئەم شارە بووم، بەهەڵکردنی ئاڵای پیرۆزی کوردستان ، خونچەی هیواکانم گەشایەوە ، ئەودەم بیر و هۆشم لەلای ئەو کۆمارە ساوایە بوو . ڕۆژنامە و وێنەی پێشەوامان بە نهێنی بەسەر خەڵکدا بڵاو دەکردەوە و هانی جەماوەرمان دەدا ، تا پشتیوانی لێبکەن ، بەڵام کە کۆماری مهاباد هەرەسی هێنا ، پێشەوا و هاوڕێیانی لە سێدارە دران ، ئێمەی کچانی شار بەو بۆنەیەوە پرسەمان دانا ، ئەمما پرسەکەمان بەشێوەیەکی تر بوو کە تێیدا بیر و ڕای ئافرەتانمان بەسەر کەوتن بەهێز کرد لەڕێگەی خوێندنەوەی ووتار و شیعر و پەخشان و سروودی نیشتمانی .

پرسیار / سەردانی چەند وڵاتت کردوە و چالاکیتان چۆن بوو ؟

و/ لەژیانمدا سەردانی چەندین وڵاتم کردووە ، لەهەموو سەردانەکانیشم دا هەوڵم داوە کێشەی ڕەوای گەلەکەم و ژنان بگەیەنمە ئەو وڵاتانە ، بۆ بەشداری کردن لە کۆنگرەی جیهانی ژنان لە ساڵی (١٩٥٩) چوومە وڵاتی چین ،بەجلو بەرگی کوردیەوە ، ووتاری ژنانی عێراق و کوردم خوێندەوە ، کە بووە مایەی سەرنجی ئامادەبووان ، هەربۆ مەبەستی بەرگریکردن لە پرسی ژنانی وڵاتەکەم سەردانی وڵاتانی ئێران و پاکستان و هیند و کۆریا و ڤێتنام و ئەڵمانیا و سۆڤیەتی جاران و تورکیا و یۆنان و ڕۆمانیا و بولگارستانم کردووە .

پرسیار / بزووتنەوەی ژنان لەم شارە ، هەنگاوی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە ، بەرای ئێوە پێشەنگەکانی ئەو بزووتنەوەیە کێ بوون ؟

و/ لای زۆربەی خەڵك ئاشکرایە ، کە شاری کۆیە لە پێشەوەی کاروانی کوردایەتی بووە ، ژنانی شارەکەش شان بەشانی پیاوان لەو رێبازەدا هەرگیز درێغیان لە تێکۆشان و قوربانیدان نەکردووە ، بەلام لە نێوان ئەو ژنانەدا چەند کەسێکیان هەمیشە وەکو ئەستێرەی پرشنگدار دەدرەوشانەوە ، لەوانە : ( عەیشێ قالە رەواندزی ) و ( بەسێ ی حەمەد ) و ( جەمیلە مستەفا ) و ( عیفەت کاکە مەلا ) و ( کاترینا ئیبراهیم ) و ( شەهید عائیشە گوڵ ) و ( عاسمە بەهجەت).

پرسیار / چۆن رۆڵی ژنان لە خەباتی شاخ و هەڵدەسەنگێنێ ؟

و/ هەڵبەتە جیاوازیەکی بەرین لە نێوان هەلو مەرجی خەباتی ئەوسا و ئێستا هەیە ، ئەودەم وولاتەکەمان لە زروفێکی سەخت و دژوار دابوو ، دیکتاتۆریەت بواری بەهیچ دەنگێکی ئازاد نەدەدا لەگەڵ ئەوەشدا ژنی کورد نەخشی دیاری لەکایەی تێکۆشانی سیاسی و رێکخراوەییدا هەبووە ، هەواڵ و چالاکیەکانی شۆرشیان دەگەیاندە شاران ، لە شاریشەوە داوودەرمان و پێداویستی تر و دەنگ و باس و جموجۆڵی رژێمیان بە شۆرش دەگەیاند ، لەو ژنانەی رۆڵی مەزنیان لەو سەردەمەدا بینیوە ( هێرۆخانی ئیبراهیم ئەحمەد ) بوو لەم رۆژگارەشدا کە کوردستان لە دۆخێکی ئازاد و دیموکراتدا دەژیێ ، هەلێکی چاك لەبەردەم ژناندا رەخساوە بۆ بەدەست هێنانی مافە زەوتکراوەکانیان، هەڤاڵ ( مام جەلال ) یش هەمیشە پاڵپشتێکی گەورەی بزووتنەوەی ژنانی کوردستان بووە .

## ڕۆڵی چایخانه لەژیانی هونەری و ڕۆشنبیری و سیاسی کۆیه

کۆیه هەمیشه له بزاڤی ڕۆشنبیری و هونەری و زانستی و ئایینی و سیاسیدا ڕۆڵی بەرچاوی بینیوه، تەنانەت هەندێك پێیان وایه ڕۆژگارێك مەڵبەندی ڕۆشنبیری هەولێر بووه.. ئێمه لێرەدا لەبەر ڕۆڵی مێژوویی چایخانەکان بەرله پەیدابوونی تەلەڤزیۆنو گەیاندنی کارەبا بۆ کۆیه هەڵوەسته دەکەین و تیشك دەخەینه سەر پەیدا بوونو بڵاو بونەوه و کاریگەری لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتیو سیاسی شارەکه .

تاڵ و شیرنی پێکەوه نەمدیوه ، چابێ چانەبێ

هەرکەسێکی هەمنشینی چانەبێ پێت چانابێ

وای بۆ دەچم کەسێك نازانێ کێ یەکەم چاخانەی لەم شاره کردەوه..؟ هەڵبەته ئاشکرایه پەیدابوونی چا زۆر لە بڵاو کردنەوەی چاخانه کۆنتره..! پێش قاوەخانەو چایخانه، ئاغاو دەوڵەمەندەکانی کۆیه، بۆ هەیبەتو سەلماندنی کەسایەتی خۆیان دیوەخانیان داناوه .

دیوەخانەکەی ( ئەمین ئاغای ئەختەر ) کە پیاوێکی ناسراوی سەردەمەکەی بوو ، جیاوازی لەگەڵ دیوەخانی ئاغاکانی تردا هەبوو، چونکه ئەو دیوەخانەیه وەکو یانەیەکی ئەدەبیو قوتابخانەیەکی هونەری وابوو، واته ناوەندێکی ڕۆشنبیری بوو

وەك دەگێڕنەوه یەکەم کەس کە چایخانەی لەکۆیه کردبێتەوه ، پیاوێکی عەجەم بوو، چایخانەکەشی لەسەر گۆمی ( حەمەد بەگ ) داناوه، لەدوای ئەو پەیتا پەیتا خەڵکی دیکه چایخانەیان کردەوه، وەك (

عەبەی چایچیو قاله چاوشین و سەعدی ئاغا ) ئـەو سـەعدی ئاغایـە چایخانەیەکی خۆشو بەهەرمێنی هەبووە، چونکە ئـەو یەکـەم کەسـێك بـووە لـە دەرەوەی کۆیـەوە گۆینـدەی بـۆ کۆیـە هێنـاوە، بـەو هۆیـەوە چایخانەکەی ناوبانگی دەرکردووە .

دوای ئەوەی( کاوێس ئاغا ) ئاهەنگی لە چایخانەکەی سەعدی ئاغا سـازدا، لـە ئەنجامـدا چـایخانەکەی( حـەکیمی چایـچیو سمـایلی سـەرمابردی) هونەرمەنـدانی وەکـو(عـەزیز ئاغـاو حەمـەی ناسـرو لۆغسلوو مەلا سابیر کەرکوکلی و شەهابەی هـەولێری ) داوەت بکـەن بۆ ئاهەنگ گێران لەچایخانەکاندا .

شایانی نووسینە، هەندێك لەو خـاوەن چـایخانانە، خۆیـان دەنگیـان خۆش بووە، وەکـو( تۆفیقـە درێـژو عەبـەی چاپـچی) ئـەوەی دواییـان چایخانەکەی لەمەیدانی خـوارێ بـوو، سـەماوەرێکی لـە ئێرانـەوە بـۆ هاتبوو، کاتێك سـەماوەرەکە جۆشـی دەدا لەبەرامبـەری دادەنیـشێتو گۆرانی دەگووت، هەروەها لەچایخانەکەی( حەمەشـینو شـێخ محێـدینو حەمەگەمخانو فەتاح حەکیم ) ناوەناوە هونەرمەندان( مـەلا ئەسـعەدو سێوەو دەروێش سمایلو حەمەدەمین عەباس و وەستا باقی حـەلاق ) بـە دەنگە بەسۆزەکانیان کۆڕی ئەو چایخانانەیان دەرازاندەوە ...

لەشەوانیشدا کاتێك خەڵك لە نوێـژی شـێوان دەبوونـەوە زۆربـەیان روویان لەو چایخانانە دەکـرد بەتایبـەتی چـایخانەی ( حەمـە گـەمخان و فەتاح حەکیم ) ئامادەبوانیش بەدەم یاری سینی و زەلفـانێ تـا کـازیوە بەدەم یاریەوە، گوێیان بۆ دەنگ و سەدای ( کاوێس ئاغا ) شل دەکرد

# له قه‌وانه‌وه بۆ ئه‌نته‌رنێت

پێش ئه‌وه‌ی رادیۆ په‌یدا بێت ( گرامافۆن ) هه‌بوو، که سندوقیشیان پێده‌گووت، گرامافۆن دوو جۆری هه‌بوو، یه‌كێكیان له‌شێوه‌ی جانتا بوو، که له‌مالآن به‌كار ده‌هات جۆری دووه‌م بۆرپیه‌ی هه‌بوو، ئه‌وه‌یان زیاتر له چایخانه و دیوه‌خانه‌كان ده‌بینرا، ئه‌وانه‌ی گوزه‌رانیان باش بوو ئه‌و ئامێره‌یان هه‌بوو، وه‌كو مالێ ( حاجی مه‌جید ) که یه‌كه‌مجار ئه‌و گرامافۆنی هێنایه كۆیه، دواتر مالی ( كاكه زیاد و عوسمان عه‌ونی ) هێنایان .

له‌دوای كردنه‌وه‌ی به‌شی عه‌ره‌بی رادیۆی به‌غدا له ١٩٣٦/٦/١ رادیۆ له‌كۆیه نه‌بوو، به‌لآم دوای ئه‌و رووداوه ده‌وله‌تی عێراق به‌مه‌به‌ستی پرۆپاگه‌نده بۆ سیاسه‌ته‌كانی خۆی ژماره‌یه‌ك رادیۆی له‌شاره‌كانی عێراق دانا، له‌وانه له‌كۆیه ئه‌و رادیۆیانه‌ی له شوێنێكی له‌بار دانا، تا خه‌لك له‌رێگه‌ی ئه‌و رادیۆیانه‌وه گوێبیستی هه‌واله‌كانی جیهان و عێراق بن . به‌شه كوردیه‌كه‌ی ئێزگه‌ی به‌غدا له‌سالی (١٩٣٩) كرایه‌وه ، له‌سه‌ره‌تادا هه‌ندێك كه‌س پێیان وابوو ئه‌وه سیحره یاخوا هه‌ر بروایان نه‌ده‌كرد، كه ئه‌و سندوقه دارینه قسه‌بكات ( عه‌ولای كه‌بابچی‌و مام به‌هجه‌ت‌و حاجی محه‌مه‌دی كاله‌ك دروو ) له‌و

کەسانە بوون بروایان نەدەکرد.. تەنانـەت چـەند کەسـێکی گـەرەکی ( هەواو ) دەیانگوت پیاوێك خۆی شاردۆتەوەو قسان دەکات.

لەساڵی ١٩٤٥ هونەرمەند ( تایەر تۆفیق ) بۆ یەکەمین جار چەند گۆرانیەکی لە رادیۆی کوردی بەغدا کە بەشێوەی راستەوخۆ بوو چـڕی، لـە رۆژی پەخـشی ئـەو گۆرانیانـەدا خـەڵکێکی زۆر لـە چـایخانەی خوالێخۆشبوو( حەمە گەمان ) بۆ بیستنی ئەو گۆرانیانە کۆببوونەوە ئەو چەپکە گۆرانیە بە مەقامی لە( گوڵێ لە سورە گـوڵێ و بەسـتەی کراس زەردێ ) دەستی پێکرد .

# چایخانه، یاخود یانەی ئەدیب و هونەرمەندان

چایخانەی خوالێخۆشبوو ( حەمە گەمحان ) ببووە شوێنی بەشێکی زۆری ئەدیب و هونەرمەندو سیاسەتمەدارانی سەردەمی خۆی ، زۆربەی جاران ( سێوە و تایەر تۆفیق‌و مەلا ئەسعەدو حەمەدەمین عەباس )و هونەرمەندانی شارەکانی تری کوردستان روویان تێدەکرد .

بەشێوەیەکی رێك‌و پێکیش رووناکبیرانی وەکو ( کەریم شارەزاو ئەحمەد دلزار و سامی عەودالّ‌و دلّدارو جەلال جۆبار و غەریب پشدەری‌و مەولود ژاکاور خوالێخۆشبوو تایەر ئەحمەد حەویزی ) روویان تێکردووە .

چەندین کۆری ئەدەبی‌و سیاسیش لەم چایخانەو چایخانەکەی ( فەتاح حەکیم ) ئەنجامدراوە.. بەشێوەیەکی گشتی ئەم دوو چایخانەیە رۆڵێکی بەرچاویان بینیوە، لەبەر پێشبردنی بواری ئەدەبی‌و هونەری‌و خەباتی سیاسی گەلەکەمان لەم شارەدا.. لەچایخانەی( سەعیدی مەلا ئەحمەد ) چەنین شانۆیی نمایش دەکرا، شانۆگەری کاوەی ئاسنگەرو ژن بە ژن و شیربایی‌و بازرگانی ڤینیسیا و ئینتیخابات نموونەیەکن لەم جۆرە شانۆیاتە .

بەهۆی ئەوەی( حەمە گەمحان ) دۆستی شیوعیەکان بوو( فەتاح حەکیم ) یش دۆستی پارتیەکان بوو، بۆیە دۆست‌و ئەندامانی ئەو دوو

حیزبه بەپێی ئینتیمای حیزبیان هاتوچۆی ئەم دوو چایخانەیان دەکــرد، چونکه لەو سەردەمەشدا شەقامی سیاسی کۆیه بەسەر هەردوو حیزبــه سەرەکیەی ئەوســا ( شــیوعی و پــارتی ) دابــەش ببــون، جــا بــەهۆی ململانێ‌و ناکۆکیانەوه چەندین جار پێکدادان و توندو تیژی لــه نێــوان ئەو دوو بەرەیەدا دەبــوو، کــه لەئەنجامــدا ســەرو گــوێلاکی هــەردوو لا دەشکا.

## ژنان لەنێوان توند وتیژیو بەدەستهێنانی مافەکانیان

ئەگەرسەرنجێکی خێرا لەرۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەمرۆ بدەین، تێبینی دەکەین چەندین بابەتی جۆرا وجۆردەربارەی پرسی ژنان بلاو دەکرێتەوە.. ئەگەر چی کۆمەڵی کوردەواری لەم سالانەی دواییدا پێشکەوتنی بەرچاوی بە خۆیەوە بینیوە بە تایبەتی لە بواری کۆمەلایەتیدا.. بەلام هێشتا مەسافەیەکی بەرینمان ماوە بگەینە ئامانج، دیاردەی کوشتنی ژنانو کچان بە بەهانەی شەرەف پارێزیو سوکایەتی پێکردنو توندوتیژی دەرهەق بە ژنان هێشتا ناونیشانی زەقی سەر لاپەڕەی میدیای کوردی پێك دێنن.

ئێستا بە هۆی بڕیارەکانی سەرۆکی هەرێمو پشتیوانی کردنی(مام جەلال) لە مافو داخوازییەکانی ژنانو هەوڵی رێکخراوەکانی ئافەرتانو ژنانی کوردستانو هۆشیاربوونەوەی زیاتری ژنان ئالوگۆڕێکی نوێی خولقاندووە، کە بە هۆیانەوە ژنان بە ئازادی داکۆکی لە مافەکانیان دەکەنو بە لێوەشاوەیی خۆشیان توانیوانە بگەنە پایە بەرزەکانی ئیداری حکومەت.. هەلبەتە ئەوە ناگەیەنێ کە دونیا شامی شەریفەو هیچ هەڕەشەیەك بەرامبەر ژناندا نەماوە، هێشتا کۆسپو تەگەرە زۆرن.. بەلام ئەوەی مایەی دلخۆشییە شەمەندەفەرەکە کەوتۆتە ڕێو هەردەبێ بگاتە قۆناغ.

زانایەکی گەورەی جیهان دەلێت: (هیچ کۆمەلگەیەك بە تەواوەتی ئازاد نابێت تا ژنانی ئەو کۆمەلگەیە ئازاد نەبن) بەو پێیەی ژن نیوەی کۆمەڵ پێکدێنێ، بۆیە هەوڵدان بۆ ئازادی ژنانو گەیشتن بۆ ئامانجە

سەرەکیەکانی مافەکانیان، ئەرکێکـە جێبـەجێ کردنەکـەی دەکەوێتـە سەرشانی هەمووماں.. ئەگەر چی باری هەرە قورس دەکەوێتە سەرشانی ئەوانەوە چونکە پێشینان گوتوویانە ماف دەسەندرێ ، نادرێ یەکێك لە کۆسپەکانی سەر رێی خەباتی ژنان بوار نەدان بەژنان وکـچان لەلایـەن کەس وکاریانەوە بۆ خەبات کردن لەو بوارەدا .

ئێستا کەسەیری خەباتی ژنان دەکەین دەبیـنین بەشـێکی زۆر کـەم هەڵـسوراوانە کـار دەکـەن ، بـەڵام بەشـی هـەرە زۆری ژنـان وکـچان بەتایبەتی ژنان وکچانی لێپرسراوان دوورە پەرێزن ، بێگومـان ئـەوەش کاردانەوەیەکی نێگەتیڤی دروست کردووە لەسەر کاروانی خەباتی ژنان.

ئێستا کەتەماشای ژنانی کوردستان دەکەی لەکۆیە ، خانمێـك یـان کچە لێپرسراوێك بەدیناکەی لەو بـوارەدا ! قـسەی زانایـەکی دیکـەی جیهـانم بیرهاتـەوە کـە دەڵـێ : ( گەریتـەوێ بزانـی کەسـێك پێشکەوتووخوازە ، یاخود کۆنەپەرستە ، برۆ ماڵەکەی سەیری رەفتار و هەڵسوکەوتی بکە ) جابە داخەوە هەموان ( پیاوان ) بەتایبەتی توێژی لێپرسراوان وکاربەدەسـتان هەمیـشە باسـی مەدەنیـەت وپێـشکەوتن خوازی و ئازادی ژن و بەدەستهێنانی مافەکانیان دەکەن بەڵام ئەوە هەر قسەیە ، چونکە لەراستیدا پیاوێکـە بەعـەقڵی پیـاو سـالاری رەفتـار دەکات ، دەتوانم دەیان نموونە بهێنمەوە ، کەتاکو ئێـستا ژنـە بەرپرسـی راهەیە بارەگای رێکخراوێکی مەدەنی نەدیوە !.

# ستاتیکای بیناسازی لەشاری کۆیە
# حەمامەکان وەك نموونە

بوونی گەرماو لەهەرئاوەدانیەك ، نیشانەی پێشکەوتن و هۆشیاری کۆمەلأیەتی ناوچەکەیە ، لەو روانگەوە سەرنج دەدەین مێژوو نووس وگەریدەکان لەنوسینەکانیاندا بایەخێکی تەواویان بەگەرماوەکان داوە ، لەدیاری کردنی ئاستی پێشکەوتنی کۆمەلأیەتیو ئابووری وهونەری هەر شوێنێك ، کە سەردانیان کردبێت .

لەسالنامەی عوسمانی (١٩٠٦) ی ویلایەتی موسلّ بەم شێوە لەسنجەقی کۆیە دەدوێت : ( کۆیە شارێکە دەکەوێتە دامێنی چیای هەیبەت سولتان ، ئاوی زۆرەو ژمارەی دانیشتوانی لەچوار هەزارو دووسەد کەس زیاترە ، جگە لە بینایەکی میری ، یەك قشلەو دە مزگەوت وسێ تەکیەو سەدوچل دوکانوپێنج قاوەخانەوهەشت ئاشوسێ گەرماوی لێیە ) مامۆستا حوزنی موکریانیش لە پایزی (١٩٢٥) سەردانی کۆیەی کردووە و گەلێك باسی جۆراوجۆرو بەپێزی لەمەڕ هونەری تەلارسازیو باخ و دوکان و کارێز و رێگاو تەکیە و مزگەوتەکانی ئەو شارە تۆمار کردووە ، بەم شێوەیە ( کۆیە پازدە مزگەوت و سێ تەکیە و سێ گەرماو و دوو قەیسەری و گەلێك دووکان و چایخانە و مەکتەبێك و سەیارەیەکی جوان و پۆستە و

تەلەگراف و ئیدارەی گومرگ و قشڵەیەکی لێیە ) لەچوار گەرەکیش پێکهاتووە ( بایزاغا ، قەلات، هەواو ، بەفری قەندی ) ئەوکات ژمارەی دانیشتوانەکەی پێنج هەزار و حەوت سەدو نەوەدو حەوت کەس بووە .

بەسەرنجدان لەم ئامارەی سەرەوە بەتایبەتی رێژەی دانیشتوانەکەی دەردەکەێت کە ئەم شارە هەرچەندە لەو رۆژگارەدا زۆر بچووك بووە ، بەلأم لەرووی هونەری تەلارسازیدا لە ئاستێکی بەرزدا بووە ، کە ووردەکاری و جوانکاری و دەست رەنگینی ئەم وەستایانە دەردەخات تاق و هەیوان و دیوەخان و مزگەوت و گەرماو دەروازەکانیان بەنەخش و نیگار و هێلکاری ناوازە رازاندۆتەوە . ژمارەیەك لەم خانووانە بە جۆرێکی نایاب لەقسڵ و گەچ بنیات نراون ، کەبە هەموو پێوەرێکی مێژوویی و ستاتیکی دەچنە خانەی کەلەپوری نەتەوەییەوە وەکو خانووەکەی حاجی عەبدوڵڵای مسکێن .

## گەرماوەکانی دوێنێ و ئەمرۆ

گەرماوەکانی دوێنێ جیاوازیان لەگەڵ گەرماوی ئەمرۆدا نییە، تەنها لەرووی تەلارسازیو بیناسازیەوە نەبێت، گەرماوی دوێنێ ئەستێرکێکی گەورەی تێدابوو کە( عەمبار )یان پێدەگوت ئەو عەمبارە ئاوی تێدابوو، ئەوانەی دەچوونە گەرماو، دوای خۆشۆردنیان لەو عەمبارە مەلەیان دەکرد، کاتێکیش وەرزی زستان دەهات خەڵك بەتایبەتی ژنان جلەکانیان لەوێ دەشۆرد، لەسەرەتای سەدەی رابردوو وردە وردە گەرماو لەماڵان پەیدا بوو.

## گەرماوەکانی کۆیە

وەك لەپێشتر ئاماژەمان پێدا، سێ گەرماو لە کۆیە هەبوو، کەلە گەرماوە هەرە باشەکانی کوردستان بوون ئەوانیش :

- گەرماوی پیسکان خاوەنەکەی( تاهیر چەلەبیو کاکەی حەمامچی ) بوو، ئەو گەرماوە لەلای تاتوکان بوو.
- گەرماوی حەسەن ئاغا، خاوەنەکەی وەکو لەناوەکەی دیارە ( حەسەن ئاغای غەفوری ) بوو گەرماوەکە( سۆفی عەبدوڵڵا ) سەرپەرشتی کردووە.
- گەرماوی ناوەندی خاوەنەکەی ( مەلا ساڵحی موفتی و مەلا حەوێز ئاغای غەفوری ) بوو دەکەوێتە خوار مزگەوتی مام یەحیا

لەدروستکردنی گەرماوەکاندا، سوود لەقسڵ وگەچ وەرگیراوە کە لەشێوەی گومبەت دروست دەکران، بۆ رووناکی ژوورەکانیش چەند کونێك هێشترابوونەوە، وەك کلاَو رۆژنە ژوورەکانیان رۆشن دەکردەوە بەهۆی حەوزێکی گەورەوە لەرێگای دوو بەلوعەوە ئاوی سارد وگەرم دەگەیشتە ئەو دەفرە خرانەی کەلەناو ژوورەکاندا دروست کرابوون لەچەقی ئەو ژوورەدا بەردێکی لاکێشەیی گەورە هەبوو، پێیان دەگوت ( بەردی زاوا ) خەڵك لەسەری رادەکشا تاماسولکەکانیان خاو و شل ببێتەوە.

بەشەکانی گەرماو

ئاگردان: ( کورەخان ) یشی پێگوتراوە، ئەو شوێنە بوو کە ئاگری لێدەکرایەوە، ئەو کەسەی بەو کارەش هەڵدەستا بە کورەچی ناسرابوو.

سەرشۆرك: بەشە سەرەکیەکەی گەرماوەکەیە، بنمیچەکەی قوببەیەکی فراوان بوو، لەهەر چوارلاوە حەوزی بچووك بچووکی تێدابوو.

ژووری خۆگۆرین: دەکەوێتەوە پێش سەرشۆرك و گەرماوەکە ئەو کەسەی دەچووە گەرماو پێش خۆ شۆردن وپاش خۆشۆردن لەوێ جلکی دەگۆڕی، دەربارەی گەرماویش لەمێژە کورد گوتویەتی: دونیا جامی حەمامە، هەر رۆژە بەدەست یەکێکەوەیە، یاخود پیاوەتی بەئاوی حەمامەوە دەکات، یانیش دەڵێی پەشتەماڵی حەمامە هەر رۆژە بەشانی یەکێکەوەیە... هتد

## سەفەربەلك (گرانی گەورە)

لە(٣)ی ئابی ساڵی(١٩١٤) دانیشتووانی بەغدا لە پڕ گوێیان لە لێدانی تەپڵ بوو.. لە سەر دیوارەکان ئاگاداریان بینی کە وێنەی تۆپ‌و تفەنگی لە سەر کێشرابوو، لە ژێردا بە زمانی تورکی نوسرابوو(سفر بلك عسكر أولانكر سلاح باشنه).. واتا ئامادەباشی گشتی راگەیەنرا دەبێت سەربازەکان بە چەکەکانیانەوە ئامادەبن.

ئەوە سەرەتای دەستپێکردنی ئەو کارەساتە گەورەیە بوو.. کە تەنها بە تێکشکان‌و لە ناوچوونی ئیمپراتۆریەتە نەخۆشەکەی بنەماڵەی عوسمانلی کۆتایی هات، خەڵکی سادە ووشەی(سەفەر بەلك)یان بە شێوەیەك راڤە دەکرد گوایە سەفەر کردنە بۆ شارۆچکەی(وان) لە ئەنادۆڵ، رای(واو)ە کەیان کردبووە (نون)، ئەم هەڵەیە بەشێکی زۆری خەڵکی سادەی گرتوە. بەدرێژایی جەنگ خەڵك گوێیان لەدەنگی تەپڵی ئامادەباشی (سفربلك) دەبوو ، بازارو شەقام‌و شوێنی کارەکانیان بەجێدە هێشت‌و دەچوونە ماڵ و خۆیان وون دەکرد نەوەك بۆ شەرگەکان راپێچ بکرێن وشەی ( سەفەربەلك ) لەو رۆژەوە دەلالەت لەبرسێتی و مردن دەکاتەوە....! کوردستانیش هەروەکو هەرێمەکانی دیکەی قەڵەمرەوی دەوڵەتی عوسمانی دوچاری کارەساتێکی مرۆیی و ئابووری گەورە بووە ، مەگەر هەر (مەلاحەمدون )ی شاعیر توانیبێتی وێنەی

لەم کارەساتە بکێشیّ ، لەقەسیدەیەکدا بەناوی ( ئەو رۆژە چ رۆژێکە ) لەمە چەند دێرێکی ئەو قەسیدە ناوازەیەیە :-

ئەو رۆژە چ رۆژێکە دونیا شڵەژاوە
هەرکەس بەچەخاریّ جگەری قیمە کراوە
دنیا پری ئاشوبە خەلایق بەعمومی
ئاسایشی لیّ مەنعە دەڵیّ جنبوشی ئاوە
ژاندرمە ئەسورێتەوە وەك واشەی برسی
بۆلاشەی میللەت بەفروفێڵی غەزاوە
فەوتاوە لەبەر سوخرە کەرو قاترو یابۆ
وشتر سەقەت وشەل بورە گاپشتی شکاوە

لەوجەنگە خوێناویەدا جگە لە ماڵوێرانی و هەژاری شتێکی تری بۆ کورد تێدا نەبوو سەدان هەزار لە رۆڵەکانی گەلی کورد لەبەرەکانی جەنگ نغرۆبوون ، یاخود بەهۆی برسێتی و نەخۆشیەوە گیانیان لەدەستدا ، بەشی هەرە زۆری سوپای ( ئەرزە رۆم و سیواس و موسڵ ) لە رۆڵەکانی گەلی کورد بوون ، ئەم نارچەیەش دەیان پێکدادانی بەخۆیەوە بینی ، بۆیە ژمارەیەکی زۆر لەم هێزانە تووشی کوشتن و دیل و برینداری هاتن .

پرۆسەی رەشبگیری لەو رۆژگارەدا لەراوە مرۆڤ دەچوو ! جەندرمەکانی چاودێری لەهەموو شوێنێك بەدوای راکردووەکاندا دەگەرا ، ئەگەر نەیان توانیبا کەسێك دەستگیر بکەن دەچوون باوکی ،

یاخود برای ئەو کەسەیان راپێچ دەکرد ، هی واهەبوو بۆ ئەوەی خۆی بەدەستەوە نەدات دەچوو جلی ژنانەی لەبەر دەکرد ، یاخود پەنایان دەبردە بەر چیاکان و سەرۆك هۆزەکان بۆ درێژەدان بە ئاگری کورەی ئەو جەنگە کاولکاریە ، چەندین باجی جۆراوجۆرو عەنتیکەیان بەسەر خەڵکدا سەپاندبوو لەوانە: ( باجی مەڕومالأت، باجی دەغڵ ودان، باجی جەمەدانیانە و باجی کراسانە... هتد ) .

سەرەرای ئەمانە سەربازەکان دەستیان بۆکەلێن وقوژبنی مالأنیش درێژ دەکرد ، بۆ ئەوەی هەرچی زەخیرەیەك هەبێ بیدزن و بیبەن، جاری وا هەبوو خاوەن ماڵەکە لەلایەکی ترەوە زەخیرەکەی خۆی کریوەتەوە بەشی هەرە زۆری خەڵك نانی جۆومزاشیان دەخوارد بەهۆی ئەم جەنگەوە هێزی بەرهەمهێنان لە شارو گوندەکان زەبرێکی گەورەی خوارد ، رادەی بەرهەمی دەغڵ ودانو ئاژەڵ زۆر دابەزی، بەشی هەرە زۆری مەڕو مالأتی وولأتەکەمان لەلایەن سوپای عوسمانیەوە فەرهود کرا، یاخود ئاژەڵەکانیان لەبەر بێ ئالیکی لەبرسان مردن ساڵی(١٩١٧) نرخی یەك نان بە بەراورد لەگەڵ ساڵی(١٩١٢) دوانزەجار بەرز بۆوە، برنج پانزەجار، سوتەمەنی بیست جار.. لەئەنجامدا برسێتیو قاتو قڕی لەهەموو لایەك بلأو بۆوە مێژوو نوسی ناسراو( محەمەد ئەمین زەکی ) ژمارەی ئەو کەسانەی لەسەفەر بەلکدا بەهۆی برسێتیو نەخۆشیەوە گیانیان لەدەستدا ، بەنیوملیۆن کەس مەزندە دەکات، کە دەکاتە سێ یەکی ژمارەی کورد لەو سەردەمەدا .

بەهۆی شەرو گرانیەوە ژمارەیەکی زۆری کورد رویان لە بەغدا کردبوو، لەبازاڕ هاواریان دەکرد (برسیمە، برسیمە) بۆیە خەڵکی بەغدا بەساڵی (١٩١٧) یان دەگوت ساڵی برسیمە، دیارە ووشەی برسیمە هەر بەکوردیەکەی نەك بەعەرەبی .

## چەند دیمەنێکی دڵتەزێن !

لەساڵی گرانیدا، رۆژانە دەیان کەس لە کوچەو کۆڵانەکانی شار بەهۆی برسیەتیو نەخۆشیەوە دەیان ناڵاند، هەندێکیان بە ئازارەوە دەمردن، مامۆستا( تاهیر ئەحمەد حەویزی ) دەڵێ: ( بلاو بونەوەی لاشەی مردووەکان لە کوچەو کۆڵانەکان بۆکەمی ژمارەی پیاوان دەگەڕێنێتەوە، هەڵبەتە ژن ومنداڵیش توانای شۆرینو کفنو دفن کردنی مردوانیان نەبووە).. بۆیە لاشەکانیان لەو ناوە دەمانەوەو دەبوونە خۆراکی سەگو پشیلە تەنانەت هەندێك کەس لە برسان گۆشتی مردوویان خواردووە! پیاوێك بەهۆی برسیەتیو ناچاری کچێکی خۆی بە گوتکە گەنمێك داوە، ئافرەتیش هەبووە هەر لەبەر ژەمە خۆراکێك شووی بە پیاوێك کردووە! لەو رۆژانەدا منداڵی شیرە خۆرە بینراوە، کەبەسەر سنگی دایکە مردووەکەیەوە شیری مژیووە !

## سەردەمێکی نوێ

پاش تێکشکانی دەوڵەتە نەخۆشەکە.. ئینگلیزەکان بە سەرکردایەتی(کاپتن های) لە(١٩١٨/١٢/١٥) گەیشتنە کۆیەو لە لایەن دانیشتووانی شار پێشوازی کران.. لە پێش هەموویانەوە(عەولاغای حەوێزی، حەمە ئاغای غەفوری، جەمیل ئاغای حەوێزیو مەلا محەمەد جەلی زادە) پێشوازیان لێکران.. (کاپتن های) چووە سەرای حکومەت، کاروباری ئیداری شارەکەی بەم شێوەیە رێکخست:-

- حەمە ئاغای مەحمود ئاغای غەفوری، حاکمی ئیداری شار.
- جمیل ئاغای حاجی ئەسعەد ئاغای حەوێزی.
- مەلا محەمەد جەلی زادە، قازی شەرع.
- مەلا ئەحمەد سمایل ئاغای غەفوری، حاکمی سولْح.
- عبدول فەتاح ئاغای عەولا ئاغای حەوێزی، سەرۆکی شارەوانی.
- مەلا حەوێز ئاغای غەفوری، مەئموری پۆلیس.
- حاجی عەولا بەگ، مەئموری ئەوقاف.
- مەلا سدیق ئەفەندی، مەئموری تاپۆ.

# سەیرە لە کۆیە

تورکە عوسمانیەکان یەکێك بوون لەوانەی ماوەیەکی دوورو درێژ حوکمڕانی وڵاتی ئێمەیان کردووە، ئەو دەوڵەتە بە هۆی خراپی بەڕێوەبردنو ستەمی نەتەوایەتیو نا عەدالەتیو گەندەڵییەوە نوقمی تەنگەژەی ئابوریو سیاسی ببۆوە.. بەشداری کردنیشی لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا ئەوەندەی تر ئەو رژێمەی تووشی قەیرانی سەربازیو سیاسی کردبۆوە.

قەیسەری روسیا(نیکۆلای دووەم) ئەو دەوڵەتەی بە پیاوە نەخۆشەکە ناوزەدکرد.. لە گەرمەی ئەو شەڕەدا سولتانی عوسمانی بڕیاری رەشبگیری(سەفەر بەرلك)یدا.. رەشبگیری ئەوە دەگەیەنێت، کە هەر نێرینەیەك توانای چەك هەڵگرتنی هەبێت راپێچی بەرەی جەنگ دەکرا دژی ئینگلیزو فەرەنسیەکان.. بە هۆی دووریو سەختی شەڕگەکانەوە گەلێك جار سەربازەکە نەدەگەڕایەوە.. واتا دەکوژرا یان بە دیل دەگیرا.

لە سالآنی جەنگی یەکەمی جیهانی پیاوێکی تورك بە ناوی(ئیبراهیم ئەفەندی) حوکمڕانی کۆیەی دەکرد، ماڵەکەشی لە خانووی(عەزیز ئاغای ئێندزیێ) بوو لە تەنیشت تەکیەی مام خەلیفە لە گەڕەکی بایزاغا.. ئەم تەکیەیە بە مزگەوتی(شێخ سمایلی عەودالآن).. ناسراوبوو ئێستا کارلگەیە، وەك دەگێڕنەوە ئەو(ئیبراهیم

ئەفەندی)یە لەگەڵ ژنێك دەستی تێکەڵاو کردبوو، هەندێك لەو خەڵکە بەو هەواڵە پەستو بێزار ببوون.. بە تایبەتی(حاجی تۆفیق)ی ریش سپی گەڕەکی بایزاغا، بۆیە بڕیار دەدات سنورێك بۆ رەفتارە دزێوەکانی ئیبراهیم ئەفەندی دابنێت.. بۆیە(مستەفا ئیبراهیم) ناسراو بە(مچە سوسکە) هانداوە تا دەستی لێبوەشێنێت.. مستەفاش کە پیاوێکی گورجو گۆڵو ئازا بوو لە یەکێك لە شەوەکاندا ناوبراو دەداتە بەر گوللەی تفەنگە رەشکە، ئیتر وا دەزانێ کوشتوویەتی بەڵام زۆری پێناچێ دەنگی ئەوە بڵاو دەبێتەوە کە کە ئیبراهیم ئەفەندی لە رووداوی شەوی رابردوو بریندار بووە، لە ئەنجامدا مستەفا لە شار تەوەلا دەبێتو دەکەوێتە دەشتو کێوانەوە.

دوای ئەوەی هەڕەشەو فشارێکی زۆر دەکرێتە سەر خزمو کەسو کاری مستەفا سوسکە.. ئەویش بە ناچاری خۆی رادەستی میری کردەوە، بەو هیوایەی لێخۆشبوونی بۆ دەردەچێت.. بەڵام حکومەتی کۆیە بڕیاری کوشتنی بۆ دەردەکەن.. ئیتر کەسو کارو خزمانی مستەفا سوسکە هەوڵو کۆششی زۆریان داوە تا بە هەر نرخێك بێت مستەفا لە مردن رزگار بکەن.

لەم رووداوە لەگەڵ دەسەڵاتدارانی کۆیە رێکدەکەونو بە پێی ئەم سیناریۆیە دەربازی دەکەن.. ئەو شەوەی بڕیار بووە مستەفا گوللە باران بکرێ پۆلیس بە رۆژ یەکێك بە هەمان ناو لە بازاڕ دەگرن، لە شەودا لەبەردەم مزگەوتی جومعە گوللەبارانی دەکەن.. زۆری پێناچێ ئەم

هەواڵە وەکو ئاگری ناو پووش بەناو خەڵکدا بـڵاو دەبێتـەوە، هـەر لـەم ڕووداوە وای لە یەکێك لە سوبعەتچی و قۆشمەچیەکانی کۆیـە کـردووە.. بڵێت(سەیرە لە کۆیە) لە دوای ئەم ڕووداوەوەش خەڵکی هـەر کـارێکی سەیرو سەمەرە ببیستن دەڵـێن... سـەیرە لـە کۆیـە.. دیـارە ئـەم ڕوداوە خەڵکی کۆیەی تاساندووە بۆیە (حەمـاغای کۆیە) دارای لە میری کردووە کە چیتر بڕیاری لە سێدارەدان لە کۆیە جێبەجێ نەکرێت.

# شانۆ لە کۆیە سەرهەڵدان و هەڵسەنگاندنێکی سەرپێی

لەم سەردەمەدا شانۆ تەنیا پێویستییەکی مرۆیی و ستاتیکی نییە.. ەڵکوو بووەتە مەسەلەیەکی زیندوو کە راستیەکانی ژیان و داهێنان و ۆشنبیری مرۆڤایەتی بەرجەستە دەکا.. جگە لەوە شانۆ، ئەو مەیدانەیە کە بارەشی بۆ نوێخوازی و ئەزموونە نوێکانی مرۆڤایەتی دەکاتەوە.. ەسەر ئاستی جیهانیش ئەمڕۆ شانۆ دەیان چەمك و قوتابخانەی جۆراوجۆری لێبۆتەوە کە هەریەکەیان خاوەن تێڕوانین و جیهانبینی خۆیانن.

شانۆ هونەرێکی مەزن و شمولیە.. زێدە رۆیی نییە ئەگەر بڵێین لوتکەی گشت هونەرەکانە، چونکە بە راستی هەموو شێوازەکانی ێکەی هونەر لە خۆ دەگرێت وەکو مۆسیقاو گۆرانی و سەماو وەرزش و ەدەب و هتد...

لە هەموو سەردەمەکانیشدا شانۆ قوتابخانەی گەل بوو.. وانەو پەیامی رەوشت بەرزی و نیشتمان پەروەری و برایەتی لە ناو خەڵك بڵاو کردۆتەوە.. دەشێ شانۆ لە جومگەیەکی مێژوویدا لاواز بووبێ.. بەڵام گومانی تێدا نییە لە ماوەدای دوورو درێژدا هەر پەیامی خۆی گەیاندووە و گۆڕانی لەکۆمەڵدا بەدیهێناوە، یاخود رێخۆشکەربووە بۆ ئاڵو گۆڕەکان ئەم لقەی هونەر مێژوویەکی لێوان لێو لەداهێنان و هەڵوێست و جوانی هەبووە بەرامبەر کێشە سەرەکیەکانی کۆمەڵگە

رۆڵـی مـەزنی بینیـوە لەهۆشـیار کردنـەوەی جـەماوەر لەبەرامبـەر ئاستەنگە سیاسی‌و کۆمەڵایەتیەکاندا .

ئەو پەیڤانەی سـەرەوە وەکـو کلیـل وابـوون بۆچـوونە نـاو بابـەتی سستی‌و فەرامۆشنەکردنی جوڵانەوەی شانۆ لەم شارەدا ، بەپێی زانیاری مامۆستای خوالێخۆشبوو ( تایـەر ئەحمـەد حـەریزی ) یەکـەم بزاڤـی شانۆیی لەکۆیە بۆ ساڵی ١٩٣١ دەگەڕێتـەوە ئەوکاتـەی ( محمـد قـانع عبالفتاح ) لەهەوڵێکی تاکە کەسیدا لەهەیوانی سەرەوەی قوتابخانـەی کۆیسنجەقی ئولا ، نمایشێکی شـانۆیی پێـشکەش کـرد . پـێش ئـەوەی ئەنگوست بۆ کەم‌و کورتیەکان درێژ بکەین دەمەوێ ئەو راستیە بخەمـە روو کە ئەو گێژاوەی شانۆ تێی کەوتووە تەنیا لە ئەستۆی هونەرمەندان دانیـە ، بـەڵکو بەرپرسـیارێتی دەکەوێتـە سەرشـانی هـەموو لایـەك بەتایبـەتی یـەکێتی هونەرمەنـدانی کوردسـتان‌و دام ودەزگـا حیزبـی وحکومیەکانـەوە ...!شـانۆ پێویـستیەکی دەسـتە جەمعیە،پێویـستی بـەکات‌و شـوێن‌و پـشتیوانی کردنـی مـاددی و مەعنـەوی هەیـە تـا زەمینەی گونجاو بێتەدی بۆ ئەوەی شانۆکار کاری خـۆی ئـەنجام بـدات . بەڵام لێرەدا پرسیارێك خۆی دەسەپێنێ ،ئایا هونەرمەند چۆن دەتوانێت ژیان‌و بژێوی خێزانەکەی دابین بکات لە حاڵەتێکـدا گـەر هەربـەکاری هونەریەوە پابەندبێت ؟ لـەوەڵامی ئـەو پرسـیارەی سـەرەوە دەڵـێین :-
بۆئەوەی هونەرمەند بەو پەری تواناوە کاری شانۆیی داهێنەرانـە ئـەنجام

بدات ، پیویستی بەکەش‌و هەوایەکی ئازادو ژیانێکی سەر بەرزانەو گوزەران‌و بژێوی ژیانەوە هەیە .

هەموو دەزانین لەحالی حازردا کۆیە مەڵبەندێکی ڕێکخستنی لێیە و چەند کۆمیتەیەك‌و ڕێکخراوە دیموکراتیەکان ، ئەوانە هەموویان گەر بخوازن بەهەماهەنگی لەگەڵ هونەرمەندانی شار جولاًنەوەیەکی شانۆیی تارادەیەك باش دروست دەکەن . سەرەرای ئەوانە ئێستا لەم شارەدا دەیان هونەرمەندی لێوەشاوە هەیە جگە لەوە چەندین دەرچووی بەشی شانۆی پەیمانگەی هونەر جوانەکان . من پێم وایە ئەگەر هەما هەنگی و هاوکاری لە نێوان ئەو فاکتەرانە دا بکرێت دەتوانرێ جولاًنەوەیەکی هونەری شانۆیی بەرهەم بهێنین و جەماوەر لەگەڵ تەختەی شانۆدا ئاشت بکەینەوە .

## چایخانەکانی دوێنێ
## ساتێك بۆ پشوودان و فەزایەك بۆ داهێنان

گەلی کورد گەلێکی دێرین و رەسەنی ناوچەکەیە، پێش عەرەب و تورك لەکوردستان لەسەر خاکەکەی خۆی ژیاوە ، لەگەڵ پێشکەوتن و بزووتنەوەی مێژوودا ، قۆناغ لەدوای قۆناغ گەشەی کردووە و بەرەوپێش چووە . بەپێی لۆجیکی مێژوو، کوردیش لەهەنگاوە سەرەتاییەکانەوە ملی رێگای گرتووە، دوای بڕینی هەزاران کەندو لەندو نشێو، ئینجا بەم قۆناغە گەیشتووە. کەبە ( سەردەمی خێرا ) ناسراوە، ئەم گۆڕان و پێشکەوتنە، هەڕەمەکی و رێکەوت نەبووە، بەڵکو بەپێی گۆڕان و پێشکەوتنی کۆمەڵ هاتۆتەدی، پابەند بوون بەم یاسایە کارێکی حەتمیە، هەموو گەل و کۆمەڵگاکان دەگرێتەوە، بەلاَم بەرێژەی جیاواز.. ژیانی مرۆڤی کورد لە سەرەتاکانی سەدەی رابردوو وەکو ئەمرۆ نەبوو، ئەودەم هێشتا تەزووی کارەبا نەگەیەنرا بووە کۆیە، واتا کەس تەلەفزیۆن و کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت و مۆبایلی نەبوو، بۆ بەسەربردنی شەو و شەوگاری دوور و درێژی شەوان، زۆربەی خێزانەکان شەوانە سەردانی یەکتریان دەکرد، هەندێکیش لەدیوەخانەکان کۆدەبوونەوە بۆ گوێگرتن لە حیکایەتی خۆش و بەسەرهاتی قارەمانەکان و ئەفسانەکان، کەلەگەڵ هزرو عەقڵیەتی ئەوسای خەڵکەکە دەگونجا ژمارەیەکیش

بەتایبەتی ئەوانەی شەیدای هونەرو هۆگری گۆرانی بوون، دەچوونە دیوەخانە هەمیشە ئاوەدانەکەی ( ئەختەر )ی شاعیرو هونەرمەند، لەو دیوەخانەدا جاری وا هەبووە سەدای ئاوازو چریکەی هونەرمەندان لە زەردەپەڕەوە تا کازیوە ئاسمانی شەوانی کۆیەی شەق دەکرد، هەروەکو چۆن دیاردەی بلاو بوونەوەی چایخانە لەشارەکانی عێراق و کوردستان سەری هەڵدا، بەهەمان شێوە لەکۆیەش پەیتا پەیتا چایخانە سەریان هەڵدا، یەکەم کەسێك بیری لە کردنەوەی چایخانە کردبێتەوە پیاوێکی عەجەم بوو، کەلەسەر گۆمی ( حەمەد بەگ ) داینا دوای ئەو خەڵکی تر کردیانە چاو لێکەری‌و لێرەو لەوێ چەندین چایخانەیان دانا، وەکو عەبەی چایچی‌و قالە چاوشین‌و سەعدی ئاغا ئەوەی دواییان چایخانەکەی لەخوار قشڵەی کۆیە بوو، شوێنێکی خۆشی هەبوو ئەو یەکەم کەس بوو لە دەرەوەی کۆیە گۆرانی بێژی بانگهێشتی کۆیە کرد، کاتێك لە شەقلاوەوە کاوێس ئاغای هێنایە چایخانەکەی‌و چەندین ئاهەنگی بۆ گێڕا.. لەئەنجامدا ناوبانگێکی باشی پەیدا کرد، لەوە بەدواوە شەوان سەدان کەس روویان لەو چایخانەیە دەکرد، ئەوکارەی سەعدی ئاغا هانی چایەچییەکانی تری دا، کە بانگهێشتی هونەرمەندانی دەرەوەی کۆیە بکەن، وەکو حەکیمی چایچی‌و سمایلی سەرمابردی، ئەوانە عەزیز ئاغاو ئەحەی ناسرو عەجەم ئۆغڵوو مەلا سابیر کەرکوکی و شەهابەی هەولێریان داوەت دەکرد ، تاکو تەرا لەناو چایچییەکانیش کەسی دەنگ خۆش هەبوو وەکو تۆفیقە درێژو عەبەی

چایچی‌و ئەوەی دواییان چایخانەی لەخوارێ بوور تازە سەماوەرێکی نوێی لە ئێرانەوە بۆ هاتبوو، هەر کەسەماوەرەکەی بەجۆش دەهات، چەقەنەی لێدەداو بەستەی دەگوت، لەزۆربەی شارەکانی کوردستان هەندێ چایخانە هەبوو لەوانیتر بەناو بانگ تربوون، بۆ نموونە لە هەولێر چایخانەکانی عەبۆو مەچکۆ، چایخانەی دوومیان تاکو ئێستا هەرماوە شوێنی رووناکبیران‌و هونەرمەندانی هەولێرو کوردستانە، لەسلێمانیش چایخانەی( شەعب ) کەتا ئەم ساتە وەختەش بایەخێکی گەورەی هەیە لەلایەن خەلکی شارەوە.. لەکۆیەش چایخانەی(حەمە گەمحان ) رۆلی مێژوویی گێراوە لەرووداوەکاندا بەهۆی ئەوەی خوالێخۆشبوو( حەمە گەمحان ) پیاوێکی ناسراوی شارەکەبوو، هونەردۆست‌و هاوکاری دانیشتوانی شارەکە بوو، بۆیە لەهەر شوێنێك چایخانەی هەبووبێ خەلکێکی زۆر روویان تێکردووە بەتایبەتی هونەرمەندان .

گەلێك جار هونەرمەندانی وەکو: تایەر تۆفیق‌و باکوری‌و مەلا ئەسعەدوسیوەو دەرزێش سمایل‌و حەمەدەمین عەباس‌و باقی حەلاق، لەتوێژی رۆشنبیرانیش، کەریم شارەزاو ئەحمەد دلزارو سامی عەودالۆ جەلال جۆبارو غەریب پشدەری‌و مەولود ژاکاوو تایەر ئەحمەد حەوێزی بە رێکو پێکی سەردانیان کردووە جگە لەوە شوێنی بەیەکگەیشتنی سیاسیەکانیش بوو، نەخاسمە خەلکی چەپرەو، چونکە خوالێخۆشبوو دۆستی شیوعیەکان بوو.. لە شەوانی رەمەزاندا دوای ئەوەی خەلك نوێژی شێوان‌و تەراویحیان تەواو دەکرد، روویان لە چایخانەکەی(سەری

مەیدان)و سەعدی ئاغا دەکرد.. لەویّ خەلّکەکە تا پارشێو خەریکی سینیو زەڵفانیّ بوون، بە دەم یاری کردنەوە گۆرانیو بەزمیان سازداوە.

سینیو زولّفانیّ بریتییە لە دوو ریز لە یاریزان کە بەرامبەر یەکتر دادەنیشتن، هەر لایەك بیدۆڕاندبووایە دەرهەمێکی دادەنا.. بە درێژایی شەوانی رەمەزان پارەکە کۆدەکرایەوە تا دوا شەوی ئەو مانگە، ئەو دەم دەدرا بەو گۆرانی بێژانەی لە شەوانی مانگی رەمەزان گۆرانیو لاوكو مەقامیان دەچڕی، جگە لەو چایخانانەی کە ئاماژەمان بۆ کردن.. چایخانەی تریش هەبوون وەکو: (چایخانەی شێخ محێدینو چایخانەی حەمەدی کریمو چایخانەی تەمتەمان، کە عەبدوڵڵای مەلا فەتاح خاوەنی بوو و چایخانەی ئاشیلکە).. ئەو چایخانانە تا پارشێو کراوە بوون، کاتێکیش دەبوو بە پارشێو، هونەرمەندان: (عەزیز زەینەڵو حەمە عەبۆ) بە دەهۆڵو زورنا بە لێدانی ئاوازی بە جۆش لە کۆڵانەکانی شار خەڵکیان بۆ پارشێو کردن بە خەبەر دەهێنا.

ئەوەی سەرنج راکێش بوو لە ناو چایخانەکانی کۆیەدا، چایخانەکەی سەعیدی مەلا ئەحمەد بوو کە کەوتبوە بەرامبەر قائمقامیەتی شار، لەوێدا ناوە ناوە نمایشی شانۆیی پێشکەش کراوە.. لە شانۆگەریەکانی ئەوسا: (کاوەی ئاسنگەر، ژن بە ژن، شیربایی، بازرگانی، ڤینسیا، ئینتیخاباتو هتد...) پەنجاکانو شەستەکانی سەدەی رابردوو گەرمەی کاری حیزبایەتیو ململانێی سیاسی بوو لە کۆیە.

پێدەچێ(دەردە کورد) لە هەموو زەمانێك قەدەری کورد بوبێت.. زۆر جار دۆستو لایەنگرانی هەردوو حیزبە سەرەکیەکەی ئەوسا گۆرەپانی سیاسی کورد..(پارتی دیموکراتی کوردستانو حیزبی شیوعی عێراق) بە دارو بەردو چەقۆ سەرو گوێلاکی یەکتریان شکاندووە.. چایخانەکەی خوالێخۆشبوو(حەمە گەمحان) شوێنی کۆبونەوەی شیوعیەکان بوو.. چایخانەکەی(فەتاح حەکیم)یش شوێنی پارتیەکان بوو.

رۆژنامەی(أتحاد الشعب) کە زمانحالّی(ح.ش.ع)بوو، پیاوێکی دیان بە ناوی(بەشیر) دابەشی دەکرد، هەچی رۆژنامەی(خەبات)یش بوو(حەمە بەگرەز) دابەشی دەکرد، لە گازینۆی حەمە گەمحان هەردەم گوێ بیستی قەوانی نوێی هونەرمەندانی کوردو عەرەب دەبوی.. ناوبراو شەیدای دەنگی هونەرمەندی عەرەب(ام کلسوم)بوو.. هەمیشە نوێترین قەوانەکانی ئەم هونەرمەندە لە لای دەستدەکەوت.

لە سالّی (١٩٤٥) کاتێك بۆ یەکەم جار هونەرمەندی گەل(تایەر تۆفیق) راستەوخۆ لە رێگەی ئێزگەی کوردی بەغداوە بۆ ماوەی نیو کاتژمێر ئاهەنگێکی گۆرانی پەخشکرد.. لەو رۆژەدا نزیکەی(٢٠٠)کەس بۆ بیستنی ئەو ئاهەنگە لەوێ ئامادە بوون، ئاهەنگەکە بە گۆرانی(لە سۆرە گولّێ)و بەستەی(کراس زەردێ) دەستی پێکرد.. خوا لێخۆش بوو حەمە گەمحان پیاوێکی پێشکەوتوو خوازو نیشتمان پەروەر بوو، لەگەلّ هونەرمەندانو رۆشنەنبیرانی کۆیە پەیوەندیەکی پتەوی هەبوو.. هەمیشە هانی قوتابیانی دەدا بۆ درێژدان

به خوێندن و به دەستهێنانی بڕوانامه.. جگە لەوە دەستی یارمەتی بۆ قوتابییه هەژارەکان درێژ دەکرد.. بەو هۆیە لە لایەن دانیشتووانی کۆیەوە ڕێزی زۆری لێگیراوە.. بەڵام لە دوای ساڵی(١٩٧٥) کۆیەی بەجێهێشتووەو بۆ هەولێر چووەو.. ئیتر لەوێ ماڵئاوایی لە ژیان کردووە.

# کۆیە لە ئاوێنەی دوێنێدا

ئەو ئازادیو سەرفرازیەی گەلەکەمان ئەمڕۆ بەدەستی هێناوە لە خۆڕاو بە هەڕەمەکی بەدی نەهاتووە.. بەڵکوو بە خوێنی هەزارەها شەهیدو قوربانی رۆڵەکانی گەلو پشتیوانی دۆستو هێزە دیموکرات خوازەکانی جیهان بەدەست هاتوون.. یانەی سەرکەوتن.. ئەو مەڵبەندە روناکبیریو رۆشەنگەریەی سیەکانی سەدەی رابردوو بوو کە رۆڵی دیاری لە بڵاوکردنەوەی رۆشنبیریو  هەستی نەتەوایەتی لە ناو ڕۆڵەکانی گەلی کوردمان بینیوە.

یانەکە لە شاری بەغدا لەسەر دەستی بەهەشتی(مەعروف جیاووك) دامەزرا.. دیارە هەلومەرجی گشتی ئەو رۆژگارە گەلێك سەختو دژوار بوو، بە هەوڵو هیمەتی پیاوێکی وەکو(مەعروف جیاووك)و هاوکاریو دڵسۆزی گەلی کورد نەبوایە یانەکە هەرگیز چاوی هەڵنەدەهێنا.

یانەی ناوبراو دامەزراوەیەکی سەربەخۆ بوو.. واتا لە لایەن میریەوە هاوگاری نەدەکرا، بۆیە مەعروف جیاووك پەنای بردە بەر جەماوەر بۆ بەردەوامبوونی کارو چالاکیەکانی یانەکەی.. ئەوە بوو لە ەهەڵمەتێکدا سەردانی ژمارەیەکی زۆر لە شارو شارۆچکەو تەنانەت گوندەکانیشی کرد، بۆ کۆکردنەوەی پارەو باروبوو.

یەکێك لەو شوێنانەی چیاورك سەردانی کرد، شاری کۆیە بووە.. لەو سەردانەیدا(٩٠)کەس دەستی یارمەتی‌و هاوکارییان بۆ درێژ کردووە.. لەبەر زۆری ژمارەکە ئێمە لێرەدا تەنیا ناوی ئەو کەسانە بڵاو دەکەینەوە کە لە(٣)دینار زیاتریان دابوو... ئەوانەی سێ دیناریان دابوو:

(حەوێزئاغای حەبیب، عەبدول واحد چەلەبی، محمد سەعید کاك ئەسعەد، مەلا سەدر، مەلا بهاالدین، کمال حاجی مجید، تۆفیق یاسین، سالّح موشکە، حاجی سابیر مام خدر، سابیر ئیسماعیل).

ئەوانەی پێنج دیناریان دابوو:

(سلێمان ئاغا غەفوری، عبد الصمد ئاغای غەفوری، سەید حاجی ئەحمد، حاجی جمال عبد الرحمن، صمد حاجی سمایل، عبد الرحمن ئەفەندی((مەئمووری مەرکەز))، جمال جەلیل حەوێزی، سەید ئەسعەد ئاغا، رفیق حاجی سالّح، نەجیب بەگ، تایەر چەلەبی، سەلیم بەگی گرد گۆران، عبد الباقی حاجی جلال).

ئەو کەسانەی لە بیست دینار زیاتریان دابوو:

(کاکە زیاد((٥٠))دینار، حەوێزاغا((٥٠))دینار، عبد الرحمن چەلەبی((٤٠))دینار، حاجی مەحمود((٤٠))دینار، عبدالمجید چەلەبی((٢٠))دینار، عومەر تایەر ئەفەندی((٢٠))دینار، حاجی جەلال((٢٠))دینار، حسین جمیل بەگ((قائیمقام))((٢٠))دینار.

## گۆرانی و میوزیکی کوردی
## لە نێوان شێواندن و رەسەنایەتیدا

گۆرانیو میوزیك هونەرێکە مرۆڤ هەر لە منداڵییەوە تا دوا ساتەکانی تەمەنی لەگەڵیدا دەبێتو چێژو خۆشی پێدەبەخشێ.. بۆیە دەروونناسو زانایانی سایکۆلۆجی، میوزیك بە هۆکارێك دادەنێن بۆ چارەسەرکردنی گرفتی دەروونیو سڕکردنو خاوکردنەوەی مرۆڤ لە کاتی ئەنجامدانی نەشتەرگەریدا.

گەلی کورد وەکو هەموو گەلانی دیکەی جیهان لەبەرە بەیانی مێژووەوە خاوەنی هونەری خۆی بووە.. بە تایبەت مەقامو گۆرانیو هەڵپەڕکێ، نەوە لە دوای نەوە پاراستوویەتیو گەشەی پێکردووە.. لەم رووەوە رۆژهەڵات ناسی فەرەنسی(تۆمابوا) دەڵێ: (کورد لە سەردەمی ساسانیەکاندا دەستێکی باڵای لە بورای موزیکدا هەبووە.. گەلانی دەرو دراوسێ سوودیان لێبینیوە).

هونەری گۆرانیو موزیکی کوردی مۆرکێکی هەرەوەزیو ریتمێکی گورجو خێرای هەیە.. ئەوە لە کاتی سارار کوتانو دروێنەو زەوی کێڵانو دەستاڕو مەشکە ژەنیو جلیتانیو هەڵپەڕکێ رەنگ دەداتەوە.. ئەم خەسڵەتانەی هونەری کوردی نەوە لە دوای نەوە تاکو چەند ساڵێك بەر لە ئەمڕۆ هەر بە رەسەنایەتیو شکۆمەندی ماوەتەوە، ساڵەهای ساڵە

شـوانەی شمـشاڵ ژەنو دەرویـشی دەف ژەنو زوڕنـا ژەنو دەهـۆڵ کـوت، گۆرانیە رەسەنەکانی شایی سوسکەیی‌و شێخانی‌و چۆپەیی‌و ئایشۆکێ‌و هەزارو یەك بەزمی دی پاراستوە.

چریکەی دەنگە بەسۆزەکانی دەیان کەڵە هونەرمەنـدی وەك(سـەید عەلی ئەسغەرو کاوێس ئاغاو رەشۆڵ‌و عەلی مەردانو حەسەن زیـرەك) دونیای هونەری گۆرانی کوردی دەڕازێنێتەوە، ئەم دەنگە نەمرانە هـەتا چەرخی ئەم رۆژگـارە بگـەرێ لەسـەر زەیـن‌و بیرەوەریـەکانمان هـەر بـە زیندوویێ دەمێنێتەوە، لەبەرامبەر ئەم مێژووە گەشەی هونەری کوردی، بەهۆی کۆمەڵێك هۆکار هەندێك بەرهەمی کاڵ‌و کـرچ‌و نـامۆ لەگـەڵ ئەم تەوژمەی جیهـانگیری‌و بازرگـانیکردن بـە هونـەرەوە کەوتـە سـەر شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە، لەراستیدا ئەم بەرهەمـانە دوورن لە پەیامی هونەری‌و کزولاوازن لە رووی ئاوازو شیعرو مۆسیقاوە، خـراپن لەئـەداو ستاتیکی مۆسیقا .

ئەو تەوژمە نارەسەنەی هونەر( گۆران)ی نـەمر گوتـەنی: میزاجـی کوردەواری تێکـدەدات، لەیـەکێك لەبەرنامەکانیـدا کـەناڵی ئاسمـانی کوردسات فیلمێکی ئیستعرازی بـەناوی( خەپـەگیان ) پێـشکەش بـە بینەرانی کرد، دوای تەواو بوونی فیلمەکـە، گەیـشتمە ئـەو ئەنجامـەی کـەبرای هونەرمەنـد دوورو نزیـك ئاگـای لەهونـەری کـوردی نیـە!.. پێدەچێت ئەو ساڵانەی کە لـە دەرەوە ژیـانی بەسـەر بـردووە مـوزیکی دیـسکۆو رۆژئـاوا کاریگـەری زۆریـان لێکردبێـت! لـەکاتی بینینـی

بابەتەکە، لەلایەك پێکەنینم بەم کارە دەهات لەبەر لاوازیو بێناوەرۆکی فیلمەکە، لەولاشەوە بەزەییم بەهونەری کوردی دەهات، کە چۆن بەدەستی چەند کەسێکی نەشارەزا دەشێوێنرێت .

ئەو هونەرمەندە گەنجە بە هەنجەتی نوێگەریەوە بەرهەمێکی کاڵو کرچو بێتامی پێفرۆشتین! نوێگەری وەکو ئەنوەر قەرەداغی دەڵێ : جل نیە هەرکات بتەوێ لەبەری بکەیت .

نوێگەری لاسایی کردنەوەی مایکل جاکسۆنو ئیبراهیم تاتلیساس نییە، بەڵکو نوێگەریو هاوچەرخێتی لەوەدایە، کە هونەرمەند گەشە بە هونەری گەلەکەی خۆی بداتو بەشێوازێکی زانستیانە سوود لە کەلەپورە دەوڵەمەندەکەی وەربگرێت، هونەرەکەی بۆنو بەرامەی خاکی کوردستانی لێبێت، ئەو بەرهەمە لە ئامێزی لاوكو حەیرانو ئای ئایو سیاچەمانەو ئەڵڵاوەیسی چەکەرەی کردبێت .

هونەرمەندی رەسەنو نوێخواز پێویستە بۆ چاوگو سەرچاوەکانی هونەری کوردی بگەڕێتەوە، ئیلهام لەموزیكو گۆرانی کەڵە هونەرمەندانی کورد وەر بگرێت، نەك وەك هەندێ گەنجی فەریکە هونەرمەند هەر هێندە ئامێرێکی موزیکی بە دەستەوە گرت، ئیدی دەبێتە گۆرانیبێژو دەست دەکەن بەکاری کلیپو گۆرانی گوتن، تەنانەت شیعرو ئاوازیش بۆ گۆرانیەکانیان دادەنێن، ئەگەر چانسی هەبێت دەنا ئەو بەرهەمانە زوو وشك دەبنو لە گوێچکەی خەڵکدا نامێنن!.

جێی خۆیەتی لێرەدا پێشنیازێك بخەمە بەر دیدی دەزگاکانی ڕاگەیاندن، بەتایبەتی ڕادیۆو تەلەفزیۆنەکان، بە زەبیان بەخەڵك و هونەری کوردی بێتەوە، چیتر ئەو کارە خراپانە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە پیشانی خەڵك نەدەن .

## قشڵە تابلۆیەك لەجوانی و هێمای شارێك

کۆیە لەریزی ئەو شارانەی کوردستاندایە کە ئەهمیەتێکی مێژوویی و کەلەپوری دیاری هەیە شێوازی دڵرفێن و دیزاینی ناوازەو جۆری نەخش و نیگارەکانی ناو قەیسەری و خان و خانووەکانی کە بە گەچ و بەردی مەڕمەڕ جوانکاری کراون، هەروەها چەندین ئاسەواری مێژوویی لە ئەترافی کۆیە هەن وەکو شوێنەوارەکانی گوندی شیلە و ساتوقەلاو بۆگد.. لەهێما هەرە دیارەکانی کۆیە قشڵەکەیەتی، کە دوای تێپەر بوونی دەیان ساڵ بەسەر دامەزراندنیدا هێشتا بەخۆڕاگری ماوەتەوەو پانۆرامای بەسەرهات و ڕووداوە تاڵ و شیرینەکانی دوێنێ بۆ نەوەی نوێ دەگێڕێتەوە.

بەحوکمی شوێنی بڵندو ستراتیژیەکەیەوە کە دەسەلاَت و هەژموونی بەسەر هەموو لایەکەوە هەبووە، دەبینین هێزە داگیرکەرەکانی بێگانە بە درێژایی مێژوو ئەو شوێنەیان کردبووە مۆڵگەو ڕوانگە! قشڵە

ووشەیەکی تورکیە لە بنەڕەتدا قشلاغ بووە، کە شوێنی زستانە دەگەیەنێ بە درێژایی ڕۆژگار بووە بە قشڵە کە لەسەر زاران ئاسانترو خۆشترە.. ئەم شوێنەوارە بە گەورەترین‌و کۆنترین قشڵە ئەژمار دەکرێت لە کوردستاندا کە بەم شێوەیە مابێتەوە، دەربارەی دروستکردنی مامۆستای خوالێخۆشبوو( تاهیر ئەحمەد حەویزی ) لە بەرگی دووەمی مێژووی کۆیەدا نووسیویەتی: قشڵە لە ساڵی(١٨١٠)ز لە زەمانی حکومەتی محمد بەگی ڕۆمی دروستکراوە، بە گوێرەی تاپۆکەی بێت کە لەساڵی( ١٩١٤ )دەرچووە بە تورکی نووسراوە دەردەکەوێت کە ئەم قشڵەیە مولکی وەزارەتی جەنگی عوسمانی بووەو لێی نووسراوە(حربیە نظارت جلیلە سی نامنە) تا پێش ڕاپەڕینیش تاپۆکەی لە سەر وەزارەتی بەرگری عێراق بووە، هیچ زانیاریەك لەبەر دەست دانیە کە چ وەستایەك ئەم قشڵەیەی دروستکردووە، بەڵام( محمد امین شاکر ) کە لە سەرەتاکانی سەدەی رابردوو باشترین وەستای بیناسازی بووە لەم شارە، ناوبراو دەڵێ: وەستا عەباسی کوری خدر قولی بەگ لەگەڵ وەستا ئەلیاس کەرکوکی، ئەم دوانە هۆدەکانی بەشی خۆرهەلاتیان دروستکردووە بەڵگەش بۆ ئەم قسەیەمان شێوازی دروستکردنی ئەم هۆدانە لەوانی دیکە ناچن، ئەم وەستا عەباسە، وەستایەکی کارامەی کۆیە بوو جگە لەم ئیشە، ژمارەیەك خانووی لێرەو لەوێ دروستکردووە وەك خانووی کاکە جاف‌و خانووی ڕەسوڵ ئاغا لەساڵی (١٨٨٤-١٨٨٥ز) دروستی کردووە، هەروەها مزگەوتی بایز ئاغای

دروستکردووە، نـاوی وەسـتا عـەباس لەسـەر بـەردی مەڕمـەڕ لـە مزگەوتەکەدا هەیە، جگە لەمانە خـانووی کاکـەمینی مـام خـدر لـە گـەرەکی قـەلاتو خـانووی ئەسـعەد ئاغـای مەلابـەکر ئاغاشـی دروستکردووە .

## دیمەنی قشلە

درێژی قـشلە( ١١٠)م پانیەکەشـی(٩٠)م رووبەرەکەشی(٩٠٠٠) مەتر دووجایە، قشلە بە بەردو قسلّ دروستکراوە، لەهـەر گۆشـەیەکدا بورجێکی خـری لێدروسـتکراوەو (١٥) پەیـژە کەلەبـەرد دروسـتکراوە دەچێتە ناو بورجەکانەوە بورجەکانیش بـە هـەمان کەرەسـتە.. واتـا بـە بەردو قسلّ دروستکراوەو بنیات نراون، ئێستا بـورجی خۆرهـەلات لـە ناوەوەیدا بـە هەرچـوار لایـدا هـۆدەو هـۆلّی تێدایـە، دیـواری بـەردی خۆرهەلاتی لە دەرەوەدا بە دوانـزە پالّپـشت قـایمکراوە ئـەم پالّپـشتانە سالّی(١٩١١).. دوو وەستای بەغدایی دروستیان کردون، گـەر یـەکێك بە ووردی لەو پالّپشتانە بروانێ تێدەگا لـە بەشـەکانی دیکـەی قـشلە نوێترن .

## دەرگای قشلە

جوانترین بەشی قشلە بوو، دەرگاکەی دەکەوێتە ناوەراستی دیـواری بەری خۆرهەڵات، بەرزیەکەی سێ مەترو چل سانتیم بوو، دەرگای دوولا بوو لە داری رەق و ئەستووری قـایم وەك ئاسـن دروسـتکرابوو، گوللـەی تفەنگ نەیدەبری ئـەو بزمارانـەی لـە دەرگاکـە درابـوون سـەریان وەك قارچـك وابـوو، کێـشی هـەر یـەکێکیان نیوکیلـۆ گـرام دەبـوو.. ساڵی(١٩٦٤) کە پێشمەرگە پەلاماری قشڵەی داو گرتـی، هێزەکـانی دوژمیش توپبارانیان کرد، کەلە ئەنجامدا تۆپێك بـەر دەرگاکـە کـەوت وێرانی کرد.

## حەوشەی قشلە

حەوشەی قشڵە گەورەو تەختە، پانتایی حەوشەکە ژمارەیەك گـۆری لێیە پێدەچێ تەرمی ئەو چەکدارانەی لێ نێژرابێ، کە لە شەرەکانی ناو قشڵە کوژرابن لەوانە گۆری(بـاپیر فـەقێ ئەحمـەد) بـە گومـەزەوە لـە حەوشەکەدایە کە هەندێك لە ئافرەتانی شار سەردانی گۆرەکە دەکـەن، دوو تۆپی کۆن تا ساڵی(١٩٨٥) لـەم حەوشـەیەدا بـوو، لـەو سـاڵەدا کاتێك هێزەکانی حکومەت گوازرایەوە چوار قورنە، تۆپەکەیان لەگـەڵ خۆیان بردو ئیتر لەوە بە دواوە ئاسەواری نەما شایانی گوتنە یەکێك لەو

دوو تۆپە، بە تۆپی ڕەمەزان ناسرابوو کە لە سەر گردی کەکۆن دانرابوو، ساڵەهای ساڵ لەکاتی بانگی ئێوارانی مانگی ڕەمەزان دەیان تەقاند.

## هۆدەو قاوشەکان

لە دەرگا دەچویتە ژوورەوە دوو ژووری بەرامبەر یەکتر هەبوون ژوورەکەی دەستە چەپ ژووری پاسەوانان بوو، ژوورەکەی دەستە ڕاستیش ژووری بەندیخانە بوو، بەلای دەستە ڕاستی قشڵە تا کۆتاییەکەی ژمارەیەك ژووری بەرامبەر یەکتر هەبوون، لەنێوان هەردوو ژوورێکدا هەیوانێك هەبوون بەلای دەستی چەپیشدا، هۆڵێك بە درێژایی دیوارەکە دروستکرابوو، ئەم هۆڵە بەلای دەرەوەیدا پەنجەرەی هەبوو، بەلام بەشی باشووری قشڵە بەرامبەر هەرمۆتەو ڕووباری کۆیە بە درێژایی ئەم بەشە تەوێڵەی وڵاخان بوو.. ئەما دیواری پێشەوەی قشڵە کە ڕووی لە شار بوو، ئەوانە هەمووی پێکهاتبوو لە چەندین ژووری ڕێك‌و پێك کە بە گەچی سپی کرابوون، کاتی خۆی ئەو ژوورانە شوێنی سەرتاشخانەو زین دورو پێڵاو دروو و کۆگای چەك‌و تەقەمەنی بوون.

## بورجەکان

لە هەر چوار گۆشەی قـشڵە بـورجێکی لێیـە، بورجـەکان لەگـەڵ دیوارەکانی قشڵە بە یەکەوە دروست کراون.. ئـەو بورجانـە لـە سـەرەوە سەنگەری تۆپ‌و تفەنگچی بوون، هەر بورجەی شوێنی دە تفەنگچی لـە خۆ دەگرێت.

## تۆپی رەمەزانان

هەموو ئێوارانی مانگی رەمەزان زۆربەی منداڵ‌و گەنجانی گەڕەکی قەڵات دەچوونە سەر قشڵە بۆ بینینی تەقاندنی تۆپی رەمەزان، تۆپەکە لە بن دیواری نزیك قەبرستانی لای راستی قـشڵە دانرابـوو، (حەمـە عەبۆ) تۆپچییەکەی بوو.. پێش نیو سـەعات لـە بـانگی مـەغریب بـە خۆی‌و کیسەیەك باروووت دەگەیشتە ئەو شوێنە.

سەرەتا کیسە باروتەکەی دەخـستە نـاو لولـەی تۆپەکـەوە، ئینجـا هەندێك پـەڕۆی تێدەپەسـتاو هـەموو ئەوانـەی لـەوێ بـوون نیگایـان دەگواستەوە لای مزگەوتی گەورە.. چاوەڕێی ئیـشارەتی جـەنابی مـەلای گـەورەیان دەکـرد.. موئـەزینی مزگـەوتی گـەورە کـە نـاوی(مـەلا حەبیب)بوو، لە شوێنێکی دەوەستا تا مەلای گەورەی لێ دیاربێ.. کاتی بانگدان دەستێکی لێهەڵەبڕی، ئیتر حەمە عەبۆ تۆپەکـەی ئـاگر دەدار باروتیش وەکو مار فیشکەی دەکردو دوکەڵێکی سپی لێ بەرز دەبۆوە.

گرمەی تۆپەکە ئەو ناوەی دەلەرزاندەوە لە هەموو شوێنێکی شار دەنگی دەدایەوە.. ئیتر بە بیستنی دەنگی تۆپەکە خەڵك رۆژوەکەیان دەشکاند.

## کاریگەری کەلتوری ئەوان لەسەر کورد
## عەباو پەچە وەك نموونە

سەرەتاکانی سەدەی رابردوو، جگە توێژی دەستەبژێر(نوخبە) کە خاوەن رەهەندێکی زانستی ئاینیو رۆشەنبیری بوون.. زۆربەی خەلکەکەی تر چینە هەژارو نەخوێندەوارەکەی کۆمەڵی ئەم شارەیان پێکهێناوە، لەوئەتەمۆسفیرە کۆمەلایەتیەدا کە فەرهەنگو کەلتوری چینی دەرەبەگ زاڵ بوو.. دیاردەی عەبا لەسەر کردن لە لایەن ژنانەوە بلاوبووە.. جلو بەرگو پۆشاکی خەڵك بە درێژایی مێژوو ناسنامەی گەل بوو، ئەمڕۆ هەر بە جلو بەرگیانەوە دەتوانین زۆربەی گەلانی رۆژهەلات لێکدی هاوێر بکەین.. بەلام بە هۆی فاکتەری ئاینەوە یا خود بە هۆی سنوری هاوبەشەوە جلو بەرگی گەلێك خۆی سەپاندووە بەسەر گەلێکی ترەوە.. ئەوە رێك لە ژنی کورد قەوماوە کاتێك عەباو پەچەی ژنی عارەب دزەی کردە ناو پۆشاکی کوردەواریەوە.

## نیشتمانی ڕەسەنی عەباو پەچە

زۆربەی مێژوو نوس‌و گەڕیدە کورد ناسەکان هاوڕان لەسەر ئەوەی کە ژنی کورد پێش هاتنی ئاینی ئیسلام عەباو پەچەی نەناسیوە، لەو بارەیەوە مینۆرسکی دەڵێ: (ژنی کورد بێ عەباو پەچەن، بە ئازادی‌و بەبێ شەرم لە ناو کۆڕو کۆمەڵ دادەنیشن، زۆر جاریش لە گفتوگۆدا هاوبەشی پیاوان دەکەن).

(مێجەر سۆن)ی حاکمی شاری سلێمانی لەسەردەمی مەلیك مەحموود دەڵێ: (زۆر جار ڕێککەوتووە ژنی کورد پێشوازی لە پیاوان کردووە بێ ئەوەی پیاوەکەی لە ماڵ بووبێت لەگەڵیدا دانیشتووەو قسەشی لەگەڵدا کردووە.. هیچ خۆی بە شەرم‌و حەیای درۆزنانە پێشان نەداوە وەکو ژنی تورك‌و عەرەب‌و فارس).

## عەباو پەچە لەناو ژنانی کۆیە

ڕۆژگارێك لەم شارە بە تایبەتی‌و لە هەموو شارەکانی کوردستان بە گشتی، شورەیی بوو بۆ ژنان لە کاتی چوونە دەرەوەیاندا عەبایان نەپۆشیبا.. جاران خەڵك ئەگەر کچێکیان بە بێگەردو پاکیزە وەسف بکردایە دەیان گوت کچی ماڵەوەیە.. نە کەس پەنجەیەکی بینیوەو نە کەسیش گوێی لە دەنگی بووە.. ئەوکات ژنان‌و کچان بۆیان نەبوو بە بێ لەسەر کردنی عەباو پەچە بچنە دەرەوە، بە هۆی تەنکی پەچەکەوە بەردەمی خۆیان بینیوە!.عەبا هەر بەتەنها لەلایەن ژنانەوە نەپۆشراوە،

بەڵکو ئەو پیاوانەش، کە لەناو کۆمەڵ بە پیاوی ماقوڵ ناسرابوون، عەبایان بەسەر شاندا دەدا ئەو عەبایانە لە بەغدار موسڵەوە دەهاتە کوردستان، عەبای پیاوان‌و ژنان زۆر لەیەکتر دەچوون، بەلاَم عەبای پیاوان لاکانی بە نەقش‌و نیگار رازاندرابۆوە، لە سەردەمی دەسەلاَتی عوسمانیەکان جۆرێکی تر لە عەبای ژنانە پەیدا بوو، کە بە جووت عەبا ناسرابوو رەنگیان شین بوو سەرتاپای لەشی ژنەکەی دادەپۆشی بەشێك لە ژنانی کۆیە چارۆگەیان بەسەر شانیاندا دەدا، هەرچی ژنی دەوڵەمەندیش بوون ( چارشەو کەمبەلی ) کە لە ئاوریشم چنرا بوو، بۆ بازارو سەردانی مالاَن بەسەریانەوە دەبینرا. ئەگەر چی تەکنەلۆجیاو رۆشنبیری لەهەموو کون‌و کەلەبەرێکی ئەم شارەدا بلاَو بۆتەوە، بەلاَم هێشتا ژمارەیەك لە ژنان عەبا لەسەر دەکەن .

## دەرکەوتنی جلی مۆدە

لـەدوای رووداوی سـاڵی(١٩٥٨) پۆشـاکی مـۆدێرنی ژنانـە، کـە باوباپیرانمان پێیان دەگوت(عەلمودە) بلاّو بۆوە، ئەم جۆرە جلانە وردە وردە تەشەنەی کرد، بەهۆی بوونی کەمینەیەکی ئـاینی مەسـیحی‌و هـاتنی ژمارەیەك مامۆستای ژن لە شارەکانی ترەوە ئەو فاکتەرانە بوونە هـۆی بلاّو بوونەوەی جلی هارچەرخی ژنانە، نابێ ئەو راسـتیەشمان لێ ون بـێ کـەی ئـەم شـارە هەمیـشەو بەبـەردەوامی ژمارەیـەك کەسـایەتی کۆمەلاّیەتی‌و ریفۆرمخوازی ئاینی تێدا بـووە، کـە بانگـەوازی ئـازادی‌و یەکسانی نێوان هەردوو رەگەزەکەیان بلاّو کردۆتەوە .

### رەنگدانەوەی عەباو پەچە لەشیعرو گۆرانی کوردیدا

روونتر لە تیشکی خۆر ئەوەیە، کە شاعیرو گۆرانی بێـژان هەمیـشە خاوەنی هەستێکی ناسـك‌و فانتازیایـەکی رەنگـاو رەنگـن.. رەگـەزی ( مێینە )ش بوونەوەرێکی هەرە جوان‌و ناسکی ئەم سروشتەیە، هەمیشە ناونیشان‌و بابەتێکی سەرەکی ئەوان بوون بە درێژایی رۆژگار.

گۆرانی نەمر کە بەشاعیری جوانی‌و سروشت ناسراوە، لە قەسیدەی درزی پەچـە وەسـفی ژنێـك دەکـات، کـە سـپێدەیەك بـە شـەقامێکی سلێمانیدا لە پڕ بەرەو رووی دێت، ئەگەرچی ژنەکـە بـە هـۆی پەچـەو عەباوە هیچ شوێنێکی دیار نییە، بەلاّم بۆ گۆرانی جوان پەرست درزێك

ئەو پەچەوە، کەئێستێك لە عەباکەیەوە بە سە بۆ ئە دایك بوونی قەسیدەیەکی جوانو تەڕو پاراو، کە قەسیدەی(لە درزی پەچەوە) یە کە لە بەشێکی ئەو هەڵبەستەدا دەڵێ:

لەگەڵ ئەوەی لە عەباوە ئالأبوو

لە دیمەنی شیرینی ئاشکرابوو

گۆرانی بلیمەت درێژە بە هەڵبەستەکەی دەداو دەڵێ:

رۆییمو دزەی نیگام جارجارێك

لە ژێر عەبای رەشا ئەیدی نازدارێك

مابووی بگاتە عاستم چەند هەنگاوێ

درزێ کەوتە پەچەو دیم نیگای چاوێ

پێدەچێت عەبا لای هونەرمەندی گەورە(عەلی مەردان) بوو بێتە کۆسپ بۆ بینینی روخساری یارەکەی، دوای ماندو بوون بەهۆی گەرانو سوران بەدوای خۆشەویستەکەیەوە لە کۆلأنانو جادەکانی کەرکوك دەڵێ:

بەدواتا وێڵم سەڵتو سەوادە کۆلأن بە کۆلأن جادە بەجادە

نەشمیلەی چاوجوان پەچەکەت لادە پەچەت لادە

هونەر مەندی مەقاماتی کورد(تایەر تۆفیق) پێدەچێ هەمان کێشەی مامۆستا(عەلی مەردانی) هەبوو بێت، بەلأم ئەمیان کێشەی عەبا بووە، نەك پەچە..! بۆیە بە گۆرانی دەڵێت:

قەلأو سەفین بەرامبەر، یارم عەبای کردە سەر

ـانەم دەچوون بۆ سەیران، منی کردووە دەربەدەر

## کاروان و کاروانچی وکاروان سەرا

سەردەمێك کۆیە یەکێك بوو لەو شارانەی، کە رۆڵێکی گرنگی دەگێرا لە لایەنی بازرگانیو رۆشنبیریدا، لەرووی ئیداریشەوە ناوەندێکی فراوانی ناوچەکانی سۆرانو شەقلاوەو دەوروبەری رواندزیش بوو.. بەو هۆیەوە بوو خەڵکێکی زۆر لەو ناوچانەوە روویان تێدەکرد.. واتا کاروان سەرای بازرگانی شارە گەورەکانی ئەم دیوو ئەو دیوی کوردستانی ئێران بوو.

چەندین پیشەی جۆراوجۆری لێبوو وەك ئاسنگەریو دارتاشیو زەڕەنگەریو کارگەچیو خمچیو دەباخچیو جۆلاییو پێڵاو دوورو پێستە خۆشکردنو هتد... جگە لە دەیان ئاشی ئاوی کە بە هۆی هۆکاری سیاسیو زۆربوونی ئۆتۆمبیلەکانەوە بەرەبەرەو ساڵ لە دوای ساڵ رۆڵی کاروانچییەکانی خستە دواوە، ئەگینا پێشتر چەندین قەتار بە بارەوە لە شارەکانی کوردستانی ئێران دەهاتنە خانە گەورەکانی شار، بەڵام بە داخێکی زۆرەوە زۆربەی ئەو خانانەی کە بەشێك بوون لە مێژووی کۆیە ئێستا رووخاون یا خود هەر نەماون.

# شارێکی زیندوو

لەگەڵ شەفەق، کاتێك شار پێشوازی لە یەکەم تیشکی زێڕینی خۆر دەکرد، جوڵە دەکەوتە جەستەی شارەوە.. خەڵك بە کەرو بارو بە پیادەوە لە دەشتی لاجانەوە لە بناری سەفینو خۆشناوەتیو کوێستانەکانی قەندیلەوە روویان لەم شارە دەکرد، بەرهەمو کەلو پەلەکانیان لە هەردوو قەیسەری چەلەبیو حەوێزی ساغ دەکردەوە.

بۆ دابین کردنی ئەو خەڵکانەی روویان لە شار دەکرد بە خۆیانو وڵاغو بەرهەمەکانیانەوە پێویستیان بە شوێنی حەسانەوەو حەوانەوە هەبوو، بۆیە ژمارەیەك خانی گەورە لە پانتایی شار دروستکرابوون.. هەندێك لەم خانانە تا ئەم رۆژگارەش لە رووی مێژوویيو ستاتیکەوە بایەخیان لە دەست نەداوە.. بەڵام بە داخەوە هیچ دەستێکی چاکسازی نەگەیشتۆتێ تا لە تێکچوونو داڕمان رزگاریان بکات!.. جگە لە خانی(زبێدەو تایەر چەلەبيو حاجی حەبیبو قادر یاسینو محمود ئاغا).. هەردوو قەیسەریەکەی چەلەبيو حەوێزیان بە سەرهاتو رۆژانی گەشی دوێنێی ئەم شارە بۆ نەوەکانی ئەمڕۆ دەگێڕنەوە!.

# کوێستان و گەرمیان

لە هەر چوار وەرزی ساڵ قەتاری کاروانچیو دیمەنی دڵڕفێنی قەتارچییەکان هەرگیز کۆتایی نەدەهات، دەیان بازرگانی وەکو (حاجی کاکەمینو مالّی حەماغای کۆیەو عەولاّ ئاغا حەویزیو حاجی ئەسعەدو مەلا حەویزو مام فەرەجە جوور سالّحۆکی مۆشکە) هەمیشە پەیوەندی بازرگانیان لەگەڵ شارەکانی کوردستانی عێراق، تەنانەت لەگەڵ هەندێ شاری ئێرانو سوریاش هەبوو.

کاروانچیەکان لە کۆیەوە توتنو مازیو پەلکە هەنارو قەزوانو پێستەی ئاژەڵو هەنگوینو گوێزو مێوژو رەژوویان دەبردە موسڵو هەولێرو بەغداو لەوێشەوە خورماو قەسپو شەکرو چاو کوتاڵو خوێیان دەهێنایە کۆیە.. بەڵام لە سابلاغو ورمێ وە سەماوەرو کورتانو خەنەی عەجەمو مافوری لاکێشو کشمیشو قەندو قامیشی هەمەدانیان دەهێنایە کۆیە، لەم لاشەوە کاروانو قەتاری کۆیەکان دەچووە دەشتە کاکی بە کاکیەکەی هەولێر.. لێرەوە میوەو توتنیان بردووە، لەوێشەوە گەنمو دانەوێڵەیان هێناوەتەوە.

جاری وا هەبووە ئەم کاروانچیانە توشی دزو جەردە هاتوون، بۆیە زۆربەی جاران ئەو کاروانچیانە پاسەوانیان لەگەڵ خۆیان دەبرد.. وەکو شەهید(مەولودە شینو مەلا زاهیر) کە لە پاسەوانە ئازاکان بوون.

کەرەتێك ئەو کاروانەی ئەمەلا راهیزای لەگەڵ دەبێت لە چیای حەمرین جەردەیان دێتە پێشێ.. لە ئەنجامدا چەند کەسێك لە رێگرەکانو کاروانچیەکان دەکوژرێن، هەروەها بازرگانەکانی کۆیە سوودیان لە زێی بچووك وەرگرتووە بۆ گواستنەوەی کەلو پەلەکانیان.. لێرەدا شارۆچکەی(تەق تەق) وەکو بەندەرێك وابوو، لەوێوە بە قەیاغو بەلەم شتومەکیان گەیاندۆتە تکریتو سامەڕاو بەغدا.. (عەبدەی حاجی تۆفیقو ئەحمەدە خێلو عەبدوڵای دورسن) لە ناودەشتو لاجانو زار گەلیو رەژیکەریان توتنی بۆنداریان دەبردە موسڵو بەغدا.

# چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی دوێنێی كۆیە
## (بەشی یەكەم)

مێژوو هەمیشە لە جوڵانەوەی بەردەوام دایە، هەموو كۆمەڵگەو گەلانی جیهان بە ئاستی جیاواز لە پێشكەوتن‌و گەشەكردنێكی ئاسۆیی‌و ستوونی دان، لە سەردەمی ڕێنسانسەوە تا ئەم ڕۆژگارە جیهانگیری بە شێوەیەكی تر سەرخان‌و ژێرخانی بەشی هەرە زۆری ئەو كۆمەڵگەو گەلانەی خستۆتە بەردەم گۆڕانێكی سەرسوڕهێنەوە!.. لەم دەیەی دواییدا با هۆزی جیهانگیری‌و سیستەمی لیبرالی هەرچی داب‌و نەریت‌و مۆراڵ‌و چەمكە پیرۆزەكان هەیە توڕی هەڵدا، بە هۆی ئامرازەكانی پەیوەندیكردن‌و شێوازەكانی تری بە دەستهێنانی زانیاری .. ئەم گۆی زەوییە ئەمڕۆ بووە بە گوندێكی بچووك!.

بەشێكی زۆر لەو داب‌و نەریتەی كۆییەكان پشتاوپشت بۆیان بەجێ مابوو لە باب‌و باپیرانەوە، ئەمڕۆ بەرەو كاڵبونەوە دەچێت، هەندێ لەو پەیوەندییە كۆمەڵایەتیانەو شێوازەكانی كارو كاسبی‌و پیشەگەریەكان ئاسەواریان سڕاوەتەوە.. بە كورتی گۆڕانێكی قوڵ تێكڕای سەرخانی ئەم كۆمەڵگایەی گرتۆتەوە، بۆ ئەوەی نەوەی نوێی ئەم شارە لە مێژووی دوێنێی شارەكەی دانەبڕێ، لە زنجیرەیەك نووسیندا هەوڵ دەدەین بە پێی ئەو زانیاریە كەمەی بەدەستمان هێناوە نەوەكانی ئەمڕۆ سەر لە نوێ بە ژیانی دوێنێی باب‌و باپیرانیان ئاشنا بكەین.

# زستان و قاورمە

وەرزی زستانی زەمانی زوو لە زستانی ئەم رۆژگارە نەدەچوو، بە هۆی سەرماو بەفربارینیەوە، هاتووچۆو پەیوەندی لەگەڵ گوندو شارەکانی دیکە سەخت دەبوو، بۆیە خەڵك هەر لە پایزەوە خەمی زستانێکی درێژو ساردو سەختیان دەخوارد.. هەر لە دانانی پێداویستیەکانی سوتەمەنی لە نەوتێکی کەمو دارێکی زۆرو زەخیرەو پێداویستیەکانی تر.

بەهۆی ئەوەی لەو رۆژگارەدا هۆیەکانی گواستنەوەو تۆڕەکانی رێگاوبان وەکو ئێستا پێشکەوتوو نەبوون ئاستی گوزەرەکانی زۆربەی هاولاتیان نزم بوو.. بۆیە خەڵکەکە گەنمو ساوەرو بڕوشو نیسكو گەنمە کوتاوو نۆكو داندۆكو کەشكو بامیەو باینجانی ووشك کراوو لەتکە تەماتەیان دابین دەکرد، هەرچی خەڵکانی چینی سەرەوەی کۆمەڵگە بوون، قاوەرمەیان ئامادە دەکرد.. بۆ شەو چەرەی شەوانیش لەتکە هەنجیرو مێوژو دۆشاویان دادەنا بۆ خۆ پاراستن لەو سەرماوسۆڵە دوورو درێژەی زستانیش چەندین بارە داری قەلاشکەریان ئامادە دەکرد.

بە هۆی ئەوەی قاورمە خواردنێکی زەریفو بەلەزەتی کوردەواری بوو.. هەروەها لەبەر ئەوەی وەکو هەموو خواردنێکی رەسەنو

نایبەتمەندی کوردەواری رووەو لەناوچوون دەچیّ، جیّی خۆیەتی لیّرەدا ئاوڕیّکی سەرپێیی لیّبدەینەوە.

هەر خیّزانیّك بە پیّی ئاستی گوزەرانی خۆی قاورمەی دروست دەکرد، ماڵە دەست رۆیشتوەکان بەرانیّك یا خود چەند بەرخیّکیان دەکوشتەوە.. هەرچی خیّزانە هەژارەکانیش بوون ئەوا پیەە مەرِیّکیان سەردەبرِی، سەروپیّکەشیان چاك دەکردو دەیانکردە چیّشتو چەند ژەمیّکیان پیّ رادەبوارد.

پاش وورد کردنی گۆشتە نەرمەکەو خاویّن کردنەوەی دەیانخستە ناو مەنجەڵیّکی گەورەو بە رۆنی دونگەکەی سووریان دەکردەوە.. پاشان دەخرایە ناو گۆسکەو هەڵدەگیرا، دونگەکەشیان لەسەر ئاگر دەتواندەوە تا دەبووە چزیلك بە ئەستووك دەیانخوارد.

ژەمە سەرەکیەکانی خەڵك بەیانیانو ئیّواران بوو کە هەمیشە لە ساوەرو برِووشو ماش پیّکهاتبوو، خواردنی برنج لەبەر هەژاریو نەبوونی زیاتر لە بۆنەو جەژنەکاندا دەخوارد، ژەمی نیوەرِۆیانیش خواردنیّکی هەروا سادە بوو وەکو نانو چا یا خود نانو ماست.

# ژن خواستن

پێکهێنانی خێزانی نوێو پرۆسەی هاوسەر گیری هەرگیز وەکو ئێستا زۆر مەسرەفو پڕ نیگەرانی نەبوو.. زۆر بە دەگمەن حاڵەتی تەڵاق رووی دەدا.. بە پێچەوانەی رێورەسمی هاوسەر گیری ئەم سەردەمە سەرەڕای ئەو هەموو فەنتازیاو ئەتەکێتو زێدە مەسرەفەوە، زۆر سادەو بێ گێرەو کێشە بوو.

دوای ئەوەی داخوازی سەرەتایی لە پشت پەردەوە رێگەی بۆ خۆشدەکرا.. دوای چەند رۆژێك پیاوان داخوازی کچەکەیان دەکرد.. دوای جێبەجێ کردنی ئەو رێو رەسمە لە لایەن مەلایەکەوە کچەکەیان لە کوڕەکە مارە دەکرد، هەر لەو بۆنەیەدا شیرینی دەخورایەوە کە لە چەند دەنکە قەسپێك پێکدەهات، ئەو جلکانە لە ناو بوخچەیەك یا خود سندوقێك دادەنرا.

نمونەی ئەم سندوقانە تا ئەم دواییانە لە هەندێ ناوچەو گوند بەرچاو دەکەوتن.. سندوقەکە چوار لابوو.. دوو دەرگای شووشەبەندی هەبوو لە چواچێوەیەکی دارینداوو کە بە وێنەی گوڵو تەیرو ئاژەڵی ئەفسانەیی رازێنرابۆوە.. هەروەها لەگەڵ ئەو کەلو پەلانەدا چەند لێفەو دۆشەگێکی لە لۆکە دروست کراویان دەدا بە بووکەکەو لەگەڵ خۆی دەبرد، ئەگەر زاوا لە خێزانێکی دەست رۆیشتوو بوایە ئەو بووکە خان

شانسێکی زیاتری دەبوو لە کرینی زێڕو خشڵ وەك: (دوولنگ بازنی کوردی((بازنی پان)) جوتێك خڕخاڵ‌و هەیاسەو تاسی زێڕو چۆچە((بەلای گوێچکەوە شۆڕ دەبوونەوە))و پلپلە بە لێواری کلاو شۆڕ دەبۆوە.

## بووك گواستنەوە

ڕۆژێك بەر لە گواستنەوەی بووك، هاوڕێ لەگەڵ دەستە خوشکەکانی دەچوونە یەکێك لە گەرماوەکانی شار(ئێستا هیچیان نەماون) لەو لاشەوە کاکی زاوا لەگەڵ دەستەیەك لە برادەرەکانی ڕوویان دەکردە گەرماو بە مەبەستی پاکوخاوێنی‌و تیف تفەدانی خۆیان، بۆ شەوێ کچانی گەڕەك لە دەوری بووکێ کۆدەبوونەوەو دەست‌و پەنجەیان لە خەنە دەگرت(خەنەبەندان).. بۆ بەیانیەکەی‌و دوای ڕازاندنەوەی بوکەخان، سواری مایینیان دەکردو لەگەڵ چەند ئەسپ سوارێك بەرەو ماڵی نوێ هەنگاویان دەنا، بەلام ئەگەر ماڵی زاوا نزیکی (هاوسێ )ی ماڵی بوکێ بوایە، هەر بەپێ دەیانبرد بە درێژایی نێوان ماڵی بوك‌و زاوا، کەسێك ئاوێنەیەکی تا ڕادەیەك گەورەی بە پشتیەوە دەناو لەپێش بوکەکە دەڕۆیشت.

بەگەیشتنی کەژاوەکەش شایی‌و گۆرانی‌و خۆشی دەگەیشتە لووتکە، ژمارەیەك گەنج بە چەپلەو گۆرانی بەدەوری زاواوە بوون‌و پێشوازیان لە بوکێ دەکرد، زاوا کە جل‌و بەرگی نوێی پۆشیوەو بسکەی

ـمێڵی دێـو نوقمی خەیاڵو خەندە وەنەوشەییەکانی خۆی بووە، هاوکات قامیشێکی درێژی بە دەستەوە دەگرتو هەرکە بوك دەگەیشتە بەردەمی بە ئاستەمو بەهێمنی قامیشەکەی دەگەیانـدە سـەری بوکەکـە، ئینجـا بوکەکەیان دەبردە ژوورێکەوە کە تایبەت بۆ ئەو ئامادەکرابوو، رەنگبـێ هەموو تەمەنیشی هەر لەو ژوورەدا بەسەر بردبێ... بەدرێـژایی مـاوەی خوازبێنی، تەنانەت تاشەوی بەزاوا بـوون ئافرەتێـك کەبـە( بـەربوك ) ناسـرابوو هەمیـشە هـاودەمی بـوکێ بـووەو رێنمـاییو ئامۆژگـاری پێویستی بەبووکەکە داوە. پێویستە بڵێین دیاردەی ژن بە ژنو گەورە بـە بچووکیش لەناو بنەماڵەکانی کۆیەدا هـەبووە، بـەڵام لـە سـنوورێکی تەسكو دیاریکراودا....

# چەند لاپەرەیەك لە مێژووی دوێنیی کۆیە

## بەشی دووەم

## ناڵبەندی

لە سەرجەم کۆمەڵگاکانـدا سـەرنج دەدەیـن، دەیـان پیـشەو کـارو چالاکی پەیدا بووە، بۆ دابینکردنی داخـوازیو پێداویـستیەکانی مـرۆڤ ئەم شارەش خەڵکەکەی تارادەیـەکی بـاش بـە کاروبـاری کـشتوکاڵیو ئاژەڵداریەوە ژیانیان بەسەر بردووە، چـەندین کـارو پیـشەی تێـدابووە، لێرەدا بەپێی تواناو دەرفەت بەشێك لەو چالاکیانە دەخەینە بەر دیـدی خوێنەرانی ئازیز:

### ناڵبەندی

لە روانگەی یاساکانی گۆرانو گەشەکردنەوە، هەموو کۆمـەڵگەکان بەگشتیو کۆمـەڵی کوردەواری بەتایبەتی، ئـاڵوگۆری بنـەرەتی بەسـەر ژیانی کۆمـەلأیەتیو ئابووریو رۆشـنبیریان داهـاتووە، بەتایبـەتی لـەو چەند دەیەی دوایدا بەر لە شۆرشی ساڵی(١٩٥٨) کۆیە شارۆچکەیەکی بچووکی کشتوکاڵی بوو، جۆرێکیش لە چالاکی بازرگانی شمەكو کالأی پەیوەست بە پەیوەندیەکانی دەرەبەگایـەتی پێـوە دیـار بـوو، هەڵبەتـە پرۆسەی بەرهەم هێنانی کشتوکاڵو ساغکردنەوەی بەرهەمی ئاژەڵداری پێویستیان بە میکانزمێك هەبووە بۆ گۆاستنەوە.

ئامرازی سەرەکی گواستنەوەش لەو زەمانەدا خۆی لە کەرو هێستر دەبینیەوە، کە لەو رۆژگارەدا هەموو ماڵێکی ئەم شارە بەلانی کەمەوە خاوەنی زیاتر لە ئاژەڵێکی باری بوون، بۆ ئەوەی ئەو ولاغانە درێژە بەکار کردن بدەن ماوە ماوە پێویستیان بە نالکردن هەبووە، بەردەوامیش ژمارەیەك ناڵبەند هەبوون کە ئەمانە هەندێکیانن:

- وەستا عوسمانی ناڵبەند/ دوکانەکەی لە شوێنی عەبدوڵڵای مام ئەحمەد بوو.
- وەستا عومەری ناڵبەند/ دوکانەکەی لە تەك مام ئەحمەدی سەری مەیدان بوو.
- وەستا مستەفای ناڵبەند/ دوکانەکەی لە شوێنی ئێستای سەنتەری ئاسیابوو.

مانەوەی هەر ناڵێك لە قاچی ولاغەکەدا بەپێی شوێنی کاری ولاغەکە دەگۆڕا.. ئەو ولاغانەی لە پێدەشتەکاندا ئیشیان پێدەکرا، ناڵەکەی هەر شەش مانگی دەخایاند کەچی ئەوانەی لە شوێنەسەختو شاخاویەکان کاریان پێدەکرا، ناڵەکەی هەر چل رۆژی خایاندووە .هەڵبەتە نالکردن لە ئاژەڵێکەوە بۆ ئاژەڵێکی تر دەگۆڕا دەبینین نرخی نالکردنی هێستر(٣٠ ) فلس بوو، کەچی نالکردنی گوێدرێژ تەنها(٢٠) فلس بوو ناڵیش پێکهاتووە لە پارچە ئاسنێکی پانی نیمچە بازنەیی کە چوار کونی تێدایە بۆ قایم کردنی ئەو نالانە بەپەلی ولاغەکانەوە بەهۆی چوار بزماری پتەوو درێژ بووە، پێش ئەوەی وەستا

ولاغەکەی ناڵ بکردایە، سمی هەر چوار پەلی ولاغەکەی دەکرد، ئینجا ناڵەکەی لەسەر پەلی ولاغەکە دادەناو بەهۆی چەکوشەوە ناڵەکەی بە چوار بزمار قایم دەکرد، جاری وا هەبوو ولاغەکە سەر شێت بوو، جوتکەی لە شاگردەکە داوەو ئازاری پێگەیاندووە..!

ناڵ بۆ دوورخستنەوەی چاوی پیس‌و حەسوود بەسەر دیوارو سەر دەرگاکان هەڵدەواسرا.. بەڵام لە ئێستادا بەهۆی خراپی باری کشتوکاڵو کەمبوونەوەی ئاژەڵو کۆچی بەردەوامی جوتیارەکان بەرەو شارەکان، پیشەی ناڵبەندی وەکو دەیان پیشەی تری کوردەواری رووەو کزی چووە !.

## موختاری

لەو بروایەدام دەرکەوتنی دیاردەی موختاری لە کوردستان بۆ سەردەمی عوسمانیەکان دەگەرێتەوە، کە بۆ کار ئاسانی‌و راپەراندنی هەندێ کارو باری رۆژانەی خەڵك‌و گەیاندنی پەیام‌و داخوازیەکانی دەسەڵات هاتۆتە کایەوە.

لە زۆربەی شارەکاندا، تەنانەت لە هەندێ گەرەکیش موختار هەبوو بە حوکمی کارەکەی موختار هەمیشە لە جوڵەدابوو، مۆرەکەی کە لەناو کیسەیەکی پەرۆ پێچابوو، لە چایخانەیەکی دیاریکراو و زۆر کەرەتیش لە سەرا دەتدۆزیەوە، هەر کەسێك کارێکی بەموختار بوایە مۆرێکی لەسەر مامەڵەکەی دەداو ئەویش شتێکی لە گیرفان دەنا، لەگەڵ ئەنجامدانی کاروباری ژن مارەکردن‌و سەربازی‌و چارەسەرکردنی

ناکۆکی نێوان خێزانەکان‌و نێش‌و کاری کشتوکاڵ‌و پێدانی زانیاری لەسەر خەڵکی راکردو کاری دەکرد ، لەسەردەمی بەعسیەکان رۆڵی موختار گەورەتر بوو، موختار کەوتبوە ژێر فشارێکی دووفاقەوە لەلایەن میری‌و دەزگا هەواڵگریەکانی کەداوای زانیاریان لێدەکرد لەسەر پێشمەرگەو کەس‌و کاریان‌و رێکخستنەکانی شۆرش‌و فیراری عەسکەری، لەولاشەوە لەترسی سزاو تۆڵەسەندنەوەی پێشمەرگە ژیانی لەمەترسی دابوو. لەسەرەتای شۆرشی نوێدا چەندین موختار لە گوندو شارەکاندا بەهۆی بەد رەفتاریان بەسزای گەل‌و شۆرش گەیشتن، هەمیشە موختار لەبەر چاوی خەڵك مرۆڤێکی ناحەزبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەك موختار هەبوون جێی رێزی خەڵکی کۆیە بوون وەکو:

- حەمەد بەگ.. جەلالی موختار لەگەرەکی قەلات .
- حاجی صالح لەگەرەکی بایزاغا .
- مام واحێد.. باوکی شەهید جەعفەر لەگەرەکی بەفریقەندی .
- ئەحمەد لاکین.. سەید حەسەن لەگەرەکی هەواو.

# چەند لاپەرەیەك لە مێژووی دوێنێی كۆیە

## ( بەشی سێیەم )

## كەبابخانەكان

هەر لە بیستەكانی سەدەی رابردووەوە رەنگە پێشتریش ئەم شارە ناوەندێكی ئیداریو سەنتەرێكی بازرگانیو چەقی رۆشنبیری ناوچەكە بوو، ئەو وەزیفە ئیداریو رۆشنبیریو بازرگانیە وایكردووە كۆمەڵێك دامو دەزگای میری تێدا بكرێتەوە، ئەوەش وای لە خەڵكی شارو گوندەكانی دەوروبەری كۆیە كردووە رووی تێبكەن، بۆ جێبەجێ كردنو ساغكردنەوەی بەرهەمو بەرووبومەكانیان، هەڵبەتە لە حاڵەتیكی وا پێویست بووە چەندان شوێنو دوكانی لێبكرێتەوە بۆ پێشكەش كردنی خزمەتگوزاری لە بابەتی ئوتێلو خانو چێشتخانەو گەرماوو دارتاشو كورتان درو و ناڵبەندو ئاسنگەرو ....هتد، لێرەدا تیشكێكی دەخەینە سەر:

### كەبابخانەكان

- كەبابخانەی وەستا صاڵحی كەبابچی، شەریكی وەستا عەبدوڵڵا بوو، شوێنەكەی كەوتبووە دوكانی ئێستای وەستا رەشیدی كورتان دروو، لە كەبابخانەكەدا دوو جۆر كەباب پێشكەش دەكرا :
- كەبابی گەورە نەفەری بە (٣) فلس بوو.

- کەبابی بچووك نەفەری بە (۲) فلس بوو.
- کەبابخانەی وەستا حەمەدامین ناسرابوو بە حەمەدمینەگۆج، خواردنی کەبابی ئەو وەستایە زۆر بەتام و چێژبوو، لەبەرهەندێ هەمیشە بازاری گەرم بوو، ئەو کەبابخانەیە کەوتبووە شوێن دوکانەکەی حاجی صاڵحی رەحمەتی .
- کەبابخانەی وەستا قادر، ئەم کەبابخانەیە لە نێوان هەردوو کەبابخانەی وەستا صاڵح و وەستا حەمەدامین بوو.
- کەبابخانەی وەستا سەیدە کۆرە وەستاکەی رەواندزی بوو، کەوتبووە شوێنی ئێستای مام عەزیزی کورتان دروو، کەبابخانەکەی تا ئێوارە خواردنی هەبوو، لەبەر ئەوەی ئەودەم کارەبا نەگەیشبووە کۆیێ، بۆیەقیمەی کەبابیان بە( قەمە ) ئامادە دەکرد، شاگردێ بە باوەشێن کەبابەکەی دەبرژاند، بەگوێرەی قسەی هەندێ کەس کەبابی ئەو زەمانە لەهی ئێستا بەتام و چێژتر بووە .

# چێشتخانەو سەروپێخانەکان

- چێشتخانەی وەستا ئەحمەد کە خەڵکی هەولێر بوو، دوکانەکەی بەر جادەی سەرەکی کەوت، خواردنی وەستا ئەحمەد بریتی بوو لە برنجو شلەو گۆشت، نەفەری بە (١٠) فلس بوو.
- سەروپێخانەی وەستاحمد عەبۆ، ئەم پێشتر جەرگی دەبرژاند، بەلاّم دەست بەرداری بوو دەستی بە سەروپێ فرۆشتن کرد. سەرەڕای ئەوکارەی وەستا حمدعەبۆ تۆپچیش بوو، لەمانگی رەمەزاندا تۆپەکەی قشڵەی دەتەقاند .

## سەرتاشی

لەسەرەتادا دوکانی سەرتاشەکان زۆر سادەبوو، واتا وەکو دوکانی سەرتاشەکانی ئەم سەردەمە پڕ دیکۆرو ئامێری جۆراوجۆری کارەباییو بۆنو بەرامەی تێدا نەبوو، گوێزان بە بەردی هەسانو چەرخ یاخود بە قامیشێك تیژ دەکرا، کەسەرتاشەکان هەمیشە بەناو قەدیانەوە بوو، وابوە سەرتاش کارەکەی لەسەرتاشە بەردێك یاخود تەنەکەیەکەوە جێبەجێ دەکرد رۆژ لەدوای رۆژ ئەو پیشەیە بەپێی یاساکانی گۆرانو گەشەکردن گۆڕانی بەسەر دا هاتووە تا گەیشتە ئەم پێشکەوتنەی ئەمڕۆ، سەرەتاش هەر بە تەنیا کاری سەرتاشی نەدەکرد، بەڵکو چەند

ئـەركێكی تریـشی رادەپەرانـد لەوانـە: خەتەنـەكردن، ددان كێـشان، گرتنەوەی دەرمانی زاركولی، خوێن بەردان لەوكەسانەی فشاری خوێنیان بەرز بوو، لە هەندێ حاڵەتدا سـوكە نەشتەرگەریەكیـشی ئـەنجام دەدا، لەشێوەی دەرهێنـانی دورمـەڵو لـوو و تیمـار كردنـی جۆرەهـا بـرین، بەكوردیەكەی سەرتاش رۆڵی دكتۆرێكی بچوكی دەبینی .

لەشەستەكان بەولاوە هەندێ سەرتاش دوكانیان گواستەوە بۆ جادەی سەرەكی وەستا باقی حەلاق لـە سەرتاشـە كۆنـەكانی كۆیـە بـوو، بـە گوتەی خۆی سەری زۆربەی پیاوە ناسراوەكانی ئەو زەمانەی تاشیوە وەكو مامۆستا مەسعود محەمەد، عەلی عەزیز قائیمقامی كۆیە.

## جۆرەكانی تراش

وەكو هەر پیشەیەكی تر سەرتاشیش لەسـەر یـەك ریـتمو سـتایل نەرۆیشتووە، ئێمەومانان كەلـە نـەوەی دوێنـێ دەژمێـردرێین، تـا ئـەم سەردەمە چەندین مۆدێـل و جـۆری سەرتاشـینمان بینیـوە، هـەر لـەم رۆژگارەدا دەیان جۆری سەرتاشین بە دی دەكرێت، بـە تایبـەت ئەوانـەی مێرمنداڵو گەنجن دوێنێش چەندین شێوازی قژ برین هەبوو، كە ئەمانە هەندێكیانن:

- سپۆرت / هەموو قژیان سووك دەكرد.
- برۆز/ بەشی هەرە زۆری قژیان سووك دەكرد جگە لە بەشی پێشەوە

- تۆپ / تەنیا پشت مل‌و بنگوێیان دەتاشی .
- سفر / بە گوێزان هەموو قژیان تاشیوە .

هەندێ سەرتاش کەل‌و پەل‌و پێداویستی سەرتاشینیان لەسەر سینیەك دادەناو بە کۆلانان بە دوای مشتەریدا دەگەران، وەکو چۆن لە هەر پیشەیەکدا خەلکی شارەزاو دەست رەنگین هەبووە، بە هەمان شێوە لە بواری سەرتاشیشدا چەند وەستایەکی ناسراو هەبوون، کە وەستا( ئەحمەد حەلاق ووەستامعروف ) ناسراو ترینیان بوون نرخی سەرتاشین بە (٢٥) فلس بوو، هەلبەتە مندالان لەو نرخە کەمتریان دەدا.. ئەگەر چی پیشەی سەرتاشین لە دوێنێدا، تارادەیەك کارێکی قورس بوو، بەلام ئەمرۆ بە هۆی بوونی کارەباو بلاوبوونەوەی پاك‌و خاوێنیێ.. پیشەکە لە چاو جاران خۆشترو ئاسانتر بووە.

زۆربەی سەرتاشخانەکانی ئەمرۆ دەم‌و چاو هەلدەگرن.. تەنانەت برۆش رێکدەخەن‌و سەرو سمێلیش رەش دەکەنەوە.

# دۆڵی ئەسحابان و سەلکی کافران

پێش ئەوەی ئاینی ئیسلام لەرێگەی پرۆسەی فتوحاتەوە لە نیمچە دوورگەی عەرەبەوە بگاتە کوردستان، گەلی کورد زەردەشتی بوون، هەڵبەتە ئەو ئاینە تەنها پەیوەست نەبوو بەگەلی کوردەوە، بەڵکو ئاینی سەرجەم گەلانی ئێران بوو کە لەژێر سایەی ئیمپراتۆریەتی ساسانی دابوون، زەردەشتی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بەشێك بوو لە لایەنی کۆمەلایەتی و سایکۆلۆجی و شارستانی نەتەوەی کورد، ناحەزانی کوردیش دانیان بەو راستیە داناوە، سەرنج بدەن مێژوو نووسێکی رەگەزپەرستی وەکو مەسعودی دەڵێت ( ئاڤێستا زیاتر لەیازدە سەدە سەرچاوەی روحی گەلانی ئێران بووە، رابەری باوەرو پەیرەوکاری دونیایان بووە) . گەر گەلی کورد پێشی لەو هێرشانەی عەرەبان بگرتبایە، لە قۆناغەکانی دواترا دەیتوانی قەوارەیەکی سیاسی بۆخۆی پێکەوەبنێ !عەرەب کە هەر ولاتێکیان داگیر کردبێ جگە لە کەلتوری خۆیان رێیان بە هیچ کەلتورێکی تر نەدەدا چونکە دەیانزانی ئەوەی خۆیان توانای کێبرکێ و مانەوەی نەبووە، بۆیە هەمیشە کەلتوری خۆیان بە پیرۆز داوەتە قەڵەم، هی میللەتە داگیرکراوەکەش بە گومرا، دوای ئەوەی عەرەبە موسڵمانەکان کوردستانیان داگیر کر، بە زەبری هێز ئەو کەلتورە نامۆیەی خۆیان بەسەر کوردا سەپاند، ئیتر کورد سەرلەبەر

لەبۆتەی کەلتوری عەرەبە موسڵمانەکان توایەوەرکەسایەتی کەلتوری خۆی لەدەستدا، هەموو هەوڵو کۆششەکانی دواتری بۆ بوژاندەوەو رزگار بوو لەکۆتو بەندی ژێر دەستەیی بێ هودە بوو...

## شەڕی دۆڵی ئەسحابان

کاتێك سوپای عەرەبە موسڵمانەکان بەفەرماندەیی مەغدیدی کوری ئەسوەدی کیندی لەشەرەکانی دۆڵی جافایەتیو مەرگەو بیتوێن بەکاروانێك لەدەستکەوتو ژنو کچانی کورد لە رێگەی دەربەندی گۆمەسپان بەرەو دەشتی هەولێر کەوتبوەرێ .

(کاکۆ) کەبرای میری قەلآی(شیلە) بوو، کە پێشتر سوپای عەرەبەکان زەبری گەورەیان لێ دابوو و براکەیان شەهید کردبوو ماوەیەك بوو لەچیاکانی باواجیو ئاوەگرد خۆی حەشاردابوو ( کاکۆ) گەرانەوەی ئەو سوپایەی بەهەل زانی و لەگەڵ ( ئیسماعیل قولی) کە پێشتر سوپای عەرەبان بە لیپرسراوی دۆڵی سماقولیان دانا بوو لەگەڵی رێك دەکەوێت پەیمان دەبەستن تا بەیەکەوە دەست لەسوپای عەرەبان بوەشێنن، کوردەکان شوێنێکی ستراتیجی دیاری دەکەن بۆ دانانی بۆسەکەیان، ئەو شوێنەی کە کەوتۆتە نێوان گەرووی دارەمۆمن وە کلکەی هۆرەمەرزان، شوێنەکە لە ئاوی( گەراو) وەنزیکە، پێش ئەوەی خۆر ئاوابێ لە ئاسۆگەی باواجی سوپاکە دەکەوێتە ناو کەوانی بۆسەی

هێزی کوردانەوە، لەو هەڵمەتەدا جگە لەفەرماندەکەیان سەدان کەس لەو سوپایە دەکوژرێت هێزەکەیان شپرزەدەبێ و تێك دەشکێت بەلاّم دوای چەند ڕۆژێك عەرەبەکان دووبارە خۆیان ڕێك دەخەنەوە بەلاّم ئەمجارەیان بەچاوساغی هەندێ کوردی بەکرێگیراو پێشرەوی دەکەن‌و ناوچەی دۆڵی سماقوڵی داگیر دەکەن دوایی کاکۆو ئیسماعیل قولی دەکوژرێن.

من بۆخۆم شوێنی ئەو شەرەم بینیوە ئەوکاتە قەبری جەنگاوەرانی کوردو عەرەبەکانیش دیار بوون، بەلاّم بە دروست کردنی ئەو ڕێیەی دەچێتە دۆڵەکە ئەو قەبرانەش خاپوور کران.

گۆری عەرەبان(ئەسحابان) خەڵك دەچوونە زیارەتی‌و ئالاّی سپی‌و سەوزیان لەسەر دەچەقاندو بۆ چاکردنەوەی دەردو نەخۆشیەکان لێیان دەپارانەوەو بەردەکانیان ماچ دەکرد لە بەرامبەریشدا گڵکۆی شەهیدە کوردەکانیان بەرد باران دەکرد گوایە ئەمان کافرن ئەوانی تریش فریشتەن.

ئێستا لەناو کۆیەو گوندەکانی سماقوڵی هەندێ خێزان ماون بە ( ئەسحابەکوژ) بەناوبانگن لە ئێستاشدا واتە لەسەردەمی حوکمرانی خۆماڵیەوە ئەو ناوچەیە کە پێشتر لانکەی شۆڕش بوو بایەخی پێدراوە قوتابخانەو بنکەی تەندروستی‌و پرۆژەی ئاو و ڕێگەوبانیان بۆ دروست کراوە.

تێبینی: لەنووسینی ئەم بابەتە سوودی زۆرم لە کاك رشید احمد وەرگرتووە، ناوبراو جوتیارێکی بە هەڵوێستی سماقوڵی گرتکە.
ناوی گوندەکانی: سماقولچی گەلی و سماقوڵی گرتك و سماقوڵی سەروچاوە لەناوی ئیسماعیل قوڵی وە هاتووە

## کوردو بەجیهانی بوون

بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین چەمکی بەجیهانی بوون ( العولمه ) لەم دەیەی دوایی هەزارەی دووەم دا بوەتە ئەو بابەتە سەرنج راکێشە کە بە دەگمەن کەسێکمان دەست دەکەوێ خۆی بە رۆشنبیر بزانێ شتێك لەمەڕ ئەم بابەتە هەڵنەکرێنێ .

جۆگەکانی راگەیاندن خوێنراو بیستراو یاخود بینراو دەیان قسەوباس و مێزگردو سیمیناریان دەربارەی سازداوە، بۆچی نا! لەحاڵێکدا دەزانین تیشکی ئەم تەوژمە هەموو کون و کەلەبەرێکی ئەم گۆی زەویەی تەنیوە، تەنانەت ئەو گەل و ولاتانەی بەرهەڵستیشی دەکەن، لەکلاورۆژنەو دەلاقەکانەوە خۆی خزاندۆتە ناویانەوە، ئێمە لەو نووسینەدا کەوەك سەرقەڵەمێکە هەقمان بەسەر ماناو بنەماو ناوەرۆکی ( بەجیهانی بوون)ە وە نیە، بەڵکو تەنها ئاورێکی خێرا لەسەر کاریگەری بەجیهانی بوون لەسەر کێشەی گەلەکەمان دەدەینەوە، هەموومان لەسەر ئەوە کۆکین کە لەگەڵ هەڵکشان و باسك ئەستوور بوونی بەجیهانی بوون و چەند فاکتەرێکی تر، خۆری رژێمە

دکتاتۆریەکانو سیستمی تاك حیزبیو بەرەو ئاوا بوون دەچێت، سنوورەکان تا دوێنێ پیرۆزو پارێزراو بوون، ئەمرۆ کەوتۆتە بەردەم لێك ترازانەوە گەلی کوردیش لەم قۆناغەی خەباتیدا کەتا رادەیەك لە سێبەری ئازادییو سەرفرازی دایە، بەشی هەرەزۆری ئەم رەوشە نوێیە بۆ بەجیهانی بوون دەگەرێتەوە کە لە بەهاری سالی(١٩٩١) کاتێك زوومی کامیراکان وێنەی مەرگەساتو تراژیدیای کۆرەوی گەلەکەمانیان گواستەوە سەرشاشەکانی تەلەفزیۆنی وولاتە رۆژئاوایەکان، هەنگین بەهۆی ئەم وێنانەوە بۆ جاری یەکەم لە مێژوودا ویژدانو سۆزی ئەو خەلکە بەرامبەر کورد جولا، لە ئەنجامدا ناوچەی(پرۆفایدکۆمفۆرد)ی لێ هاتەدی، لە ئێستادا بەهۆی پێش کەوتنی هۆیەکانی راگەیاندنەوە، هەر لە سەتەلایتو کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت تا دەگاتە فاکسو کەنالە ئاسمانیەکان، بەهۆی ئەوانەوە جیهان بە کوردستانیشەوە بۆتە گوندێکی بچووك، ئەم لێك نزیك بوونو ئاوێتە بوونەی کۆمەلەی مرۆڤایەتی بەهەنگاوی خێرا دەباتە پێش، سالانێ کە کورد لەژێر زەبری فاشستەکان دەینالاند، هاوارو نالەی نەدەگەیشتە کەسێك یاخود ئەوان نەیان دەویست ئەو نالەو هاوارە ببیستن، بەلام ئەمرۆ بەهۆی ئەم دەستکەوتە مەزنانەی سەردەمی بەجیهان بوون، هەموو هەوالو رووداو و گۆرانکاریەکانی کوردستان زۆر بەخێرایی، بگرە لەچاوتروکانێکدا دەگاتە بەرچاوو گوێچکەی

جیهان، بەمەش وولاّتەکەمان لەهەرێمێکی پەراوێزو دابراو کردە بەشێکی زیندوو و لە پچران نەهاتوی کۆمەلّگای دەولّەتان .

## چەند سەرنجێکی رۆژنامەوانی

- شۆستە (رصیف ) لەهەموو شاران دا بۆ رۆیشتنی پیادە دروست کراوە، بەلاّم ئەوەی سەیری شۆستەی شەقامە سەرەکیەکەی شاری کۆیەی کردبێت بۆی دەردەکەیّت کە بەو شێوەیە نیە کە لەشارانی تردا هەیە، بەهۆی ئەوەی قائیمقامیەتو شارەوانی نەیان توانیوە سیستمی شۆستە بۆ پیادەو شەقام بۆ ئۆتۆمبیل پەیرەو بکەن، بۆیە سەیر دەکەین خاوەن دوکانەکانی سەوزەو میوە فرۆشتنو مێزی نانەواخانەکانو کورسی وتەپلەی چایخانەکان بەشێکی کەلو پەلەکانیان لەسەر شۆستە نمایش کردووە بەشێوەیەك ئەو شوستانەیان تەسك کردۆتەوە، هاولاّتی ناتوانێ بەرێكو پێکی هاتووچۆی بەسەرا بکات، داوا لە قائیمقامیەتو شارەوانی دەکەین رەحمێك بەو خەلّکە بکەنو ئەم گرفتە چارەسەر بکەن پێش ئەوەی ئۆتۆمبێل لەسەر جادە سەرەکیە کە یەکێك پان بکاتەوە!.
- لە زۆربەی شاران دا شوێنی یاری ئەتاریو بلیارد هەیە کە ئەو یاریانە لە شوێنی گونجاو بە پێی چەند رێنماییەك رێگەی پێدەدرێت، بەلاّم بە داخەوە لە کۆیە ئەو یاریانە لە هەندێ دوکانو تەنانەت ژێر زەمین دا دەکرێتو دوورن لە چاوی سانسۆرو چاودێریەوە، مەترسی ئەو شوێنانە لە وەدایە کە زۆربەی ئەوانەی

رووی تێدەکەن مێر منداڵو هەرزەکارن.. خۆزگە لایەنە ئەمنیەکانی شار بە ڕێكو پێکی ئەو شوێنانەیان بەسەر دەکردەوە.

٣.ماوەیەکە(ئاو) بۆتە گرفتێکی جیهانیو جێی بایەخی هەموو وڵاتان نیشتمانەکەی ئێمەش بە هۆی هەڵکەوتە جوگرافیەکەیەوە ساڵانە ڕێژەیەکی بەفرو باران لێ دەبارێ.. بەڵام بە هۆی ئەو دیاردەی وشکە ساڵی کە چەند ساڵێکە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گرتۆتەوە، بەڵام خۆش بەختانە ئەم ساڵ ڕێژەیەکی زۆر بەفرو باران لە کوردستان باری کە بووەمایەی تەقینەوەو ژیانەوەی کانیو کانیاوەکانمان بۆ ئەوەی سوود لەو ئاوی بارانو بەفرە ببینین، نەهێڵین بە فیڕۆ بڕوات بە تایبەتی لە کۆیە، دەست بکەین بە دروست کردنی چەند بەنداوێك لە حەمامۆكو تۆبزاواو پشتی گۆڕستانی دەروێش خدر.

٤.داگیرکەرانی کوردستان بایەخێکی ئەوتۆیان بە نیشتمانەکەمان نەداوە، شان بە شانی دواکەوتنی ئابووریو فەرهەنگیەوە، ویستویانە شارەکانمان لە رووی نەخشەو خزمەت گوزاری شارەوانیەوە دواکەوتوو بێتە.ئێستا وا خەریکە شاری کۆیە فراوان دەبێ وە لەگەڵ ئەو فراوان بوونەوە کێشەی هاتوچۆ سەر هەڵدەدات.. بۆ کەم کردنەوەی گرفتی هاتوچۆو جوان کردنی شار پێشنیاز دەکەم بە فراوان کردنی شەقامی حاجی قادر، هەروەها بە دوو ساید کردنی شەقامی لاوان کە لە بارەگای مەڵبەندی کۆیە تا پەیمانگەی تەکنیکی کۆیە دەگرێتەوە، ئەم شەقامەیان لە نەخشەی بنەڕەتی شارەوانی دا هەیە.

# کلاو رۆژنەیەك لەسەر تیپی موزیکی باواجی

لە دێرینەوە گەلی کورد موزیك‌و گۆرانی‌و هەڵپەرکێی خۆی هەبووە.. لە سەردەمی زەردەشتەوە موزیك لە پەرستگا دا لەگەڵ سروودە ئایینەکان دەژەندرا، ئامێرە موزیکە رەسەنەکانی ئەو رۆژگارە، نای‌و تەنبوورو دەهۆڵ‌و زورنا بوون.. دواتر ئاینەکانی ئێزیدی – ئەهلی هەق ئاوازو موزیکیان ئاوێتەی ستایش‌و شیعر کرد، بۆ دەربڕینی سۆزو نیازە ئایینەکانیان لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ساسانی موزیك‌و ئاوازی کوردی بە هەنگاوی خێر چووە پێشەوە.. تەنانەت دوای بڵاوبوونەوەی ئیسلامیش موزیك لە شێوازی پیاهەڵدان‌و ستایش درێژەی هەبووە.

نوسەری فەرەنسی(بلاو) کە بەشێکی زۆری کوردستان گەڕاوە، دەربارەی موزیك‌و گۆرانی کوردی دەڵێت: (هەژارترین هۆزی کورد لە ئاوازو ئاهەنگی دڵنەوازدا دەوڵەمەندە.. گەلێك داستان‌و بەسەرهاتی قارەمانیەتی بەرزو چیرۆکی ئەوینداران لە ناوچە دلگیرو جوانەکانی کوردستان سەداو ئاوازەکانیان دەنگ دەداتەوە).. جگە لەوە چەندین پسپۆرو شارەزای بواری هونەر ئامێرەکانی تەنبوورو عوودو کەمانجە بۆ کورد دەگەڕێنەوە.

# پێشکەوتنی بەهرەی هونەرمەندێک

دەمێکە جوڵانەوەیەکی هونەری لە ناخی ئەم شارەدا دروست بووە، لەگەڵ بەرەو پێش چوونی رۆژگار ئەو بزافەش نەشونمای کردووە، بە شێوەیەك ئاوازو هونەرو مەقاماتی سنوری ناوچەی کۆیە مۆرکێکی تایبەت بە خۆی پەیدا کردووە.. گەلێك مەقام زانی گەورەی وەك: (مەربینو نەشئەتی رەشید ئاغاو پوتیۆو حاجیە گەورەو عەبەی چایچیو مەلا ئەسعەدو سێوەو تایەر تەوفیقی لێ پەیدا بووە.. هەر کاتێك بمانەوێ قسە لەسەر ئاوازو موزیکی کوردی بکەین دەبێ ئاوڕێك لە رۆڵی ئەختەری هونەرمەند بدەینەوە چونکە ئەو رۆڵێکی مەزنی لەسەرهەڵدانو ئاشنا کردنی هاوڵاتییانی شارەکە بە هونەری کوردی گێراوە.

دیوەخانەکەی هەمیشە گەشاوە بوو، لەسەردەمی ئەودا گۆرانیو مەقام بە هەنگاوی خێرا چووە پێشەوە، بەستەو ئاوازی کۆنی کۆیەی ژیاندەوە، ئەو کۆڕو ئاهەنگانەی لە دیوەخانەکەیدا سازدەکرا وەکو وانەی قوتابخانە هونەرییەکان وا بوو.. سەرەڕای ئەوەی سەلیقەی ئاوازدانانیشی هەبوو، شاعیرێکی بە ئەزمونیش بوو.. بۆیە دەبینین هەندێك لە شیعرەکانی خۆی کردووە بە مەقامو بەستە.

گـۆرانی(شـلـەو خـان) نمونەیـەکی هـەرە بـەرزی داهێنـانی ئـەو هونەرمەندە شاعیرەیە، ئەو بناغـە پتـەوەی ئـەم هونەرمەنـدە دایڕێـژا ئەنجام و بەرهەمێکی گـەورە بـە دەسـتەوەدا.. ئـەویش(تیپـی مـوزیکی باواجی کۆیە) بوو.. لێرەدا بـە بۆنـەی تێپـەڕبوونی نیـو سـەدە بەسـەر دامـەزراندنی دا، تیشکێك دەخەینـە سـەر قۆناغـەکانی سـەرهەڵدان و گەشە کردنی.

## گەڕانەوە بۆ سەرەتاکان

لە رۆژی دامـەزراندیەوە تا ئەم ساتە وەختەش تیپی موزیکی باواجی خزمـەتێکی بێ وچانی بە هونەری کوردی بە گـشتی و ناوچـەی کۆیـەی کردووە، لە دوای تیپی مـوزیکی مەولـەوی بـە دووەم تیپـی مـوزیکی کوردی دێت لە کوردستانی عێراق دا.. لـە زۆربـەی فێـستیڤاڵ و بۆنـە نەتەوەییەکاندا حوزوریان هەبووە، دەیان تێکست فۆلکلۆری دوای پوختە کردن و بەهارمۆنی و دابەش کردنی نوێوە خستە سەر خەرمانەی هونەری کوردیـەوە، دوای ئـەوەی مـامۆسـتا بـاکوری لـە سـاڵی(١٩٥٧)..(دار المعلمین)ی تەواو کرد، لە ناوەندی کۆیە دامـەزرا.

ئەوە دەرفەتێکی زێڕینی بۆ ناوبراو رەخساند بۆ دامـەزراندی تیپێکی موزیك لـە کۆیـە، ئـەو بیرۆکەیـە چـووە بـواری پراکتیکـەوە، کاتێـك ژمارەیەك لەو قوتابییانەی کە خولیاو ئارەزووی موزیکیان هـەبوو، دوای

دەوام راهێنانیان دەکرد.. لەسەر دەستی مامۆستا باکوری بە ئامێرەکانی عودو کەمانچەو نەی.

هەر سەبارەت بە دامەزراندی تیپی موزیکی باواجی مامۆستا زاهیر محەمەد لە گۆشە نیگای خۆیەوە دەڕوانێتە ئەو ڕووداوە.. بە بۆچوونی ناوبراو ئەو تیپە موزیکیەی مامۆستا باکوری دایمەزراند، هیچ سیفەتێکی فەرمی نەبوو چونکە دوای سالێك پرۆڤە کردنو هەولدان هەموو قوتابیەکان پەرتەوازە بوون کە لە ئەنجامدا تیپەکە وجودێکی نەماو کۆتایی هات.

دوای دوانزە سالّ لەو ڕووداوە ئینجا تیپی موزیکی باواجی نوێو سەردەم کە پاشان ناوبانگی دەرکردو دامەزرا.. بە بۆچوونی مامۆستا زاهیر دوبارە ناولێنانی تیپە موزیکیەکە بە ناوی(باواجی) هەڵەیەکی مێژوویی بوو.. ئەگەر ئەو کات هەرناوێکی ترمان بۆ تیپەکە هەڵبژاردایە وەکو..(چنارۆك، حەمامۆك، دلّدار) یا هەر ناوێکی تر ئەو کاتە ناوی باواجی لە ئارادا نەدەما، تەنانەت هەر باسیش نەدەکرا.. جێی خۆیەتی لەم دەرفەتەدا ناوی ئەو کەسایەتیانە تۆمار بکەین کە یەکەم جار شەرەفی بەشدار بوونیان لە دامەزراندنیدا هەبووە.

١. مامۆستا زاهیرمحەمەد ٢. سەردار ئەحمەد عەبدوللاّ ٣. ئەنوەر تاهیر خدر ٤. جانا تۆماس جانا٥. ووریا ئەحمەد عەبدوللاّ ٦.سیامەند عیزەت تاهیر ٧. فواد سەعید ئەحمەد ٨.عەتەللاّ حەنا عبدالکریم ٩. ئیسماعیل مستەفا قادر.

بەدرێژایی تەمەنی پڕ شکۆی ئەو تیپە بەرهەمی ئێجگار خۆش‌و ناوازەی پێشکەشی بینەرو گوێگری کورد کردووە، زۆر بە دڵسۆزیەوە بەرۆحێکی تەڕی کوردانەوە پەیامی ڕەسەنی کوردیان بەخەڵك گەیاندووە، لەیەکەم فیستیڤاڵی هونەری کوردی، کە لە شوباتی ساڵی ١٩٧٤ لە بەغدا بەسترا، لەناو سەرجەم تیپە موزیکەکانی کوردستان پلەی یەکەمی بەدەستهێنا، هەر لەبەر ئەو ئاستە بەرزەی تیپەکە بوو، مامۆستای مەقاماتی کورد مامۆستا عەلی مەردان لەیەکێك لە دیدارەکانی لەگەڵ ڕادیۆی کوردی بەغدا لە ساڵی ١٩٧٦ ئەنجامی دابوو، ئەو تیپەی بە چاکترین تیپ لە کوردستان لەقەڵەم دا، ئێستا دوای بەسەرچوونی ئەو تەمەنە پڕ بەخشش‌و دوور ودرێژەدا بە چاوێکی رەخنەگرانەوە سەرنج لە چالاکی‌و کارەکانی ئەو تیپە بدەینەوە لە رووی چەندایەتی‌و چۆنایەتیەوە بە تایبەتی لەم دەساڵەی دواییدا، ئەو تیپە دەکەوێتە بەردەم پرسیارو تێرامانەوە! دەبینین ئەوکات تیپەکە درەوشاوەتر بوو لەچاو ئەمڕۆدا، دەتوانم بڵێم ئیزافەو داهێنانێکی ئەوتۆی دروست نەکردووە، چونکە ئێستا بەشی هەرە زۆری جموجۆڵەکانی تیپەکەی خۆی لە بەشداریکردن لە ئاهەنگ‌و بۆنە حیزبیەکاندا دەبینێتەوە، کە ئەوەش هەرگیز لەگەڵ سەنگ‌و شکۆی رابردوودا ناگونجێت .

# وولآتی خۆر

لەگەڵ ئەوەی لەریزی هەرە پێشەوەی وولآتە پێشکەوتووەکانی جیهان دایە، ئەندامیشە لە کۆمەڵەی هەشت وولآتە پیشەسازیەکەی جیهـان، لەگـەڵ ئەوەشـدا لـە رابـردووی خـۆی دانـەبراوەو پابەنـدە بـە دابو نەریتەکانی بابو باپیرانیان بەشێوەیەکی دیکە جیهانگیری نەبۆتە هۆی تێکدانو شـێواندنی کـەلتوور و ژیـانی کۆمەلآیـەتی وولآتـی ژاپـۆن، لەرووی گەشەسەندنی ئابووریو پێشکەوتنی تەکنەلۆجیاوە پێی ناوەتـە قۆناغی شۆرشی زانیاریەکان ئەم پێـشکەوتنەمەزنەی ژاپـۆن سـەرنجی هەموو جیهانی بۆلای خـۆی راکێـشاوە، ئێمـەی کـورد ئەگـەر پـلانو نەخشەوهەولّی جدیمان هـەبێ دەتـوانین سـوود لـە ئـەزموونی ژاپـۆن وەربگرین، زانیاریەکی هەڵە لەناو خەڵك بلآو بۆتەوە، کـە گوایـە ئـەو گەشەسەندنو پێشکەوتنە ئابووریە مەزنەی وولآتی ژاپـۆن دەگەرێتـەوە بۆ کۆتایی جەنگی دووەمی جیهان، بەلآم کاتێـك لاپـەرەکانی مێـژووی ئەم گەلە زیندووە هەڵدەدەینەوە بۆمان روون دەبێتەوە، کـە ژاپۆنیـەکان هەر لە نیـوەی یەکـەمی سـەدەی نۆزدەهەمـەوە دەسـتیان کـردووە بـە شکاندنی کۆتو بەندی دواکەوتنو وابەستەییو هەنگاو هەڵێنان بەرەو جیهانی شارستانیو دیموکراسیو پێشکەوتنەوە .

## گەرانەوە بۆ سەرەتاکان

ساڵی ١٨٢٥ (پیری) کە ژەنەراڵێکی گەورەی ئەمریکی بوو بۆ یەکەمجار پێی خستە سەر کەنارەکانی ژاپۆن، هەنگینیّ ژاپۆن بەدەست رژێمی( تۆکوغاوا) گیرۆدە بوو بوو ئەو رژێمە لە ساڵی ١٦٣٠تا ساڵی١٨٦٧ جڵەوی دەسەڵاتی ئەو وولاتەی بەدەستەوە بوو، ئەو ژەنەراڵە ئەمریکیە رژێمی تۆکوغاوای ناچار کرد تا دەست بەرداری گۆشەگیری بێ‌و دەرگای بازرگانی ئازاد بەرووی رۆژئاوا بخاتە سەر پشت، پیری لەگەڵ خۆیدا ژمارەیەکی زۆر کتێب‌و چاپەمەنیەکانی بواری بیرکاری‌و زانستە مرۆییەکانی هێنابوو، سیاسەتی کرانەوەی بازاری ئازادو هێنانی ئەو ژمارە زۆرەی کتێب‌و چاپەمەنی لەگەڵ ئەم فاکتەرانەی خوارەوە ئارێتەی یەکتر بوون‌و زەمینەیەکی لەباریان رەخساند بۆ ئەوەی ژاپۆن لەو گۆشە گیریە بێتەدەرەوەو لە ئەنجامدا بگاتە ئەو ئاستە بەرزەی پێشکەوتن، کە هەموومان ئاگادارین.

- کاریگەری ئاینی کۆنفۆشیوسی شوێنەواری قوڵی لەسەر رەفتارو رەوشت‌و هەڵسوکەوتی ژاپۆنیەکان نەخشاندبوو، بەتایبەتی بۆ هاندانی خەڵك لەبورای پسپۆری‌و ووردبینی‌و بنیات نانەوەی گۆمەڵگەی ئوستۆکراتی.

- مرۆڤـی ژاپـۆنی کـارکردنی زۆر بـەلاوە گـرنگو پـیرۆزە، بۆیـە ئەودڵسۆزیەیان لەبورای بنیـات نانـەوەدا گـەلێك ئـەنجامی باشـی لێهاتەدی.
- هەموو ژاپۆنیەك بەچاوی باوك ( سەرۆك خێزان) سەیری ئیمبراتـۆر دەکەن، هەڵبەتە ئەم هۆکارەش بووە مایەی پابەنـد بـوونی مرۆڤـی ژاپۆنی بەکۆمەڵگەکەیەوەو پتەوبوونی گیانی هەرەوەزیو هاوکـاری لەنێوانرۆڵەکانی گەلی ژاپۆنیەوە .
- جگە لەوە بوونی پەیوەندیـەکی رۆحـی دەگمـەن لـە نێـوان چـینە جیاوازەکانی کۆمـەڵگە .
- گواستنەوەی ئەزموونو شارەزاییەکانی ئەوروپا، کە پاشان چـەندین میتۆدو بیروڕای جۆراوجۆری لێکەوتەوە.
- بلاو بوونەوەی زانستو زانیاریو هۆشیاری میللی .

## سەردەمی زێرین

- لەئاکامی بلاو بوونەوەی هۆشیاریو رۆشـنبیریەوە، ژاپۆنیـەکان گەیشتنە ئەو راستیەی کە شەڕ کردن بەکەسێك ناکرێت، کـە شمـشێری پۆلاینو گورزەی گەورەی هـەڵگرتبێ، بەرامبـەر چـەکی پێـشکەوتوو زانستی هاوچەرخی رۆژئاوا لەبەر رۆشنایی ئەو راستیە ریفۆرمخوازەکـان تەنیا لەمیانەی بیست ساڵدا، توانیان تـەپو تـۆزی چـەندین سـاڵەی

دواکـەوتن‌و گۆشـەگیری لـە جەسـتەی شـەکەتی ژاپـۆن دابتـەکێنن سەرئەنجام توانیان دیدو بۆچوون‌و ئەجینـدای خۆیـان بـسەپێنن، دوای زیاتر لە سەدەونیوێك( گۆرباچۆف) سەرۆکی پێـشوتری روسـیا لەسـەر هەمان رێبـازی گەشەسـەندنی ژاپـۆن رۆیـشت، بـەلاّم دیـارە هـەرگیز مێژووکتومت خۆی دووبارە ناکاتـەوە، ئەگـەر دووبـارەش بێتـەوە ئـەوا بەشێوەیەکی کاریکاتێری دەبێت، بۆیە دەبینین هەوڵەکانی(گۆرباچۆف) نـەك هـەر نوشـستی هێنـا، بـەڵکو پەیکـەری یـەکێتی سـۆڤیەتیش لەباریەك هەڵوەشایەوە، مرۆڤ لەئاست تاقیکردنەوەی ژاپۆنیەکان دەستە وەستان دەبێ تۆ دیقەت بدە وولاّتێك بەبێ پێشینەیەکی سیاسی دیـاری کراو و پلانێکی ئابووری‌و هاوکاری وولاّتان، بێ ئەو پـشتیوانیانە چـۆن توانی ئەم ئاڵوگۆرە قوڵە ئەنجام بدات ...

## ڕامان لەچەند وێستگەیەکدا

دوای تێپەر بوونی پەنجا ساڵ بەسەر جەنگی دووەمی جیهانیدا، کـە ژاپۆنیەکان قورسترین زەبریان بەرکەوت، کەچی چەند ساڵێك دوای ئـەو جەنگە کاولکاریە، وورده وورده ژاپۆنیەکان برینـەکانیان سـارێژکردەوە، هەر بەوەش نەوەستان، بەڵکو ئـەمرۆ ژاپـۆن لـەریزی هـەرە پێـشەوەی وولاّتـە پێـشکەوتووەکانی جیهانیدایـە لەئێـستادا کۆمپانیـای( تۆیۆتامۆتۆرز)ی ژاپۆنی لەساڵی پاردا ژمـارەی پێوانـەیی تۆمـارکرد، بەوەی فرۆشیەکانی ئـەو کۆمپانیایـە لـە ئۆتـۆمبیلی جـۆری(الگـوس

الفربيه) له بازاره‌کانی ئه‌مریکاو رۆژئاوا به‌ریژه‌ی(٢٥٪) زیادی کـردو قازانجه‌که‌شـــی گه‌یـــشته‌(٨٠٨) ملیـــار دۆلار، هـــه‌روه‌ها داهـــاتی کۆمپانیای( تی.تی. ئین) بۆ تۆری ته‌له‌فزیۆنی بیته‌ل له‌هـه‌مان سـالّدا گه‌یشته‌ ترلیۆنیك دۆلار له‌سالّی (١٩٨٤)دا ئه‌مریکا هه‌شـت ملیـۆن ئۆتۆمبیلی به‌رهه‌م هینا، به‌لاّم ته‌نیا دوو ملیۆنی فرۆشرا که‌چی ژاپـۆن له‌ هه‌مان سالّدا هه‌مان ژماره‌ی به‌رهه‌م هینا ، که‌چی چوار ملیۆنی لیّ فرۆشت . ئه‌مرۆ ژاپۆن (٣٠٪)هه‌موو به‌رهه‌می ئۆتۆمبیلی جیهان پیّك ده‌هینیّت، به‌پیّی ئامارێك که‌ ریکخراوی نه‌ته‌وه‌ یه‌کگرتووه‌کان ئه‌نجامی داوه، ده‌رکه‌وتووه‌ هه‌رمالّیّکی سه‌ر ئه‌م زه‌ویه‌ لانی کـه‌م پیّـنج ئـامیّری کاره‌بـایی ژاپـۆنی تیّدایـه‌ جگـه‌ لـه‌و(٨٤٪)به‌رهـه‌می جیهـانی کامیراو(٨٣٪)به‌رهه‌می سعات‌و(٦٦٪)به‌رهه‌می ته‌له‌فزیۆنی هـه‌موو جیهان به‌رهـه‌م دێنیـت به‌راسـتی پیّـشکه‌وتن‌و داهێنانـه‌کانی ژاپـۆن هه‌موو جیهانی سه‌رسام کردووه.

# كارگەچی پیشەیکی لەبیرکراو

کاتێـــك ســـەرەنج لەمێـــژووی نیـــشمانەکەمان دەدەیـــن، بۆمـــان دەردەکەوێت ئەم گەلەی ئێمـــە بـــە چـــەند قۆنـــاغ و ســـەردەمی جیاجیـــا تێپەریوە، هەرلە قۆناغی کۆچەری وشوانکارەییوە، تا دەگاتـــە قۆنـــاغی نیشتەجێبون و بنیادنانی گوندو شارەکان و پراکتیزەکردنی کوشـتوکاڵ وبازرگانی و پیشەسازیەوە، شوێنەوارە مێژوویـــەکانمان لـــە ئەشـــکەوتی (شـــانەدەرو هـــەزارمێردو زەرزی و گونـــدی چـــەرمۆ نزیـــك چەمچەمال)رەسەنی و دێرینی و شارستانی ئەو گەلـــە دەســـەلمێنیت ...! لەرۆژگارێکی زووەوە چەندین کارو پیشەی دەستی لەم ناوچەیەدا ســـەری هەڵداوە بەشێکی ئەم پیشەیە دەستیانە تا کۆتایی هەشتاکانی ســـەدەی رابردوو لەبرەو دا بوون و بازاریان گەرم بوو، هەندێك لەو پیشانە ئەگەر کورد قـــەوارەی سیاســـی خـــۆی هەبوایـــە ،ئێـــستا بەشـــێك دەبـــوون لـــە پیشەسازی ئـــەو ولاتـــە ، بـــەلام بـــەهۆی بایـــەخ پێنـــەدان و چـــۆلکردنی گوندەکان ، ئەم پیشە دەستیانە بەرەو نەمان چـــوون، ئـــەوەی ئاشـــکرایە ئاژەڵداری وباخچەوانی و هەندێك کـــاری کـــشتوکاڵی، رۆژانیـــك بەشـــی هـــەرە ســـەرەکی دێهاتـــەکانی دەشـــت و رۆژئـــاوای کۆیـــەو ناوچـــەی خۆشناوەتیان پێك دەهێنا . هەڵبەتە جل و بەرگ وپۆشاکی ئەو خەڵکـــە بە دانیشتوانی شارەکانیشە وە وەکو ئەوە ی ئێستا هەیە جوان نـــەبوون ئیتر بۆخۆ پاراستن لە سەرماو سۆڵەی زستان مـــرۆڤ هەمیـــشە هـــەوڵی داوە جل و بەرگ و رایەخ و پێخەفێك دەستەبەر بکات ، کەلە کەرەســـەو بەرهەمی ئاژەڵ دروستکرابێت، خوری و موو و پێستەی ئـــاژەڵ باشـــترین

کەرەستەن ،کە مرۆڤ لەو رۆژگارەدا توانی پێداویستیەکانی خۆی پێدابین بکات، بەکەڵەکە بوونی ئەزموون وشارەزای توانی لبادو کەپەنك و سەرکڵاو و پوزەوانەو هتد..... دروستبکات. لە موو جاجم و بەرماڵ و خرارو شەڵتە ورەشماڵ وگوریس دروست بکات ،بەڵام بەداخەوە ئەم پیشەیە ئەمرۆ بەهۆی بڵاوبوونەوەی کارگەکانی جل و بەرگ و رایەخ و کۆمبارەوە ئەو گرینگیەی جارانی لە دەست داوە، ئەگەر چی هەندێك لەمەردارەکان قاپوت و کەرك وسەرکڵاو بەکار دێنن .

## هەندێك زانیاری دەربارەی کارگە چێتی

جگە لەوەی لباد لە ماڵ ولە دیوخانان راخراوە، ژنان بۆ رازاندنەوەو جوانی ماڵەکانیان سودیان لێبینیوە ،نەخش و نیگاریان لەسەر دروست کردووەو بەدیوارەوە هەڵیانواسیوە، لباد چێتی لەباوکەوە بۆکورەکان پیشەکەی بۆ گواستراوەتەوە، واتا خێزان هەیە لەکۆیە چەندین پشتە ئەو پیشەیە دەکات . ئێستا ئەم پیشەیە لەکوردستانی ئێران بایەخ وبازاری لەدەست نەداوە، ئەویش بەهۆی زۆری مەرو ماڵات و ئاوەدانی گوندەکان ... کارگەچیەکان لەسەرەتای وەرزی بەهارەوە سەردانی گوندەکانی دەشتی کۆیەیان دەکرد، ئیدی جوتیارانی ئەم گوندەو گوندەکانی تریش لوایان لای وەستاکە

بۆجێبەجێ کردنی ئەو کارە مەبەستیان بوو، بەهۆی ئەو پەیوەندیانەوە ئاشنایەتی و دۆستایەتی لەنێوانیان دروست دەبوو، تەنانەت وارێکەوتووە ژن و ژنخوازیشی لێدروست بووە . پایزانیش کەدەشتەکیەکان بۆ هێنانەوەی کەلوپەلەکانیان سەردانی کۆیەیان دەکرد بەدەست بەتاڵی نەدەچوون ، بەڵکو لەگەڵ خۆیان پەنیرو هەنگوین وگوێزو مێوژیان بەدیاری بۆ لبادچیەکان دەبرد ئەویش ئیزنی نەدەدان . تا چەند شەوێك لەلای دەمانەوە ...!بەشێك لەو کارگەچیانە ، کارگەیان لەماڵەوە دانابوو، وەستا فەقێ ساڵح یەکێك بوو لەوکارگەچیانەی دەزگاکەی لە نهۆمی خوارەوە سازدابوو، خۆیشی لە نهۆمی سەرەوە دەژیا، ئەوەی جێی تێرامانە ئافرەتیش شانبەشانی پیاوان کاری لبادچیەتیان کردووە بەدەست لوایان گێراوە، سەرکڵاو و پوزەوانەو ساق و گۆرەویان دروستکردووە . وەك باسمان کرد ئەم پیشەیە مێژویەکی کۆنی هەیە لەم شارەدا ، لەمیانی ئەو ماوە دوورو درێژەدا چەندین کەس و بنەماڵە ناوبانگیان بەو پیشەوە دەرکردوە . وەکو وەستا بەکری یا گورجی و وەستا فەقێ ساڵحی وکاکەی رەسولە درێژ ناسراو بە مەلاکاکەو حاجی کەریمی عەباس ووەستا رەئوفی گەراو.

## دروست کردنی لباد

با بەیەکـەوە سـەرێك بـە یـەکێك لـەو دوکانـە دەگمەنانـەی کارگەچـیەکان خواربکەینـەوە بـۆ ئـەوەی بـزانین لبـاد چـۆن دروسـت دەکرێـت لەسـەرەتای بـەهاردا یـاخود لەناوەراسـتیدا دەستدەکرێ بە برینەوەی بەرخ لوا(بەرگن)

ی بەرخەکە دەبەنـە لای لبادچی،پێویستە بزانین لـوای بزن چیرە بـۆ لبـاد نابێـت، بـەلکو بـۆ(بـەن)بـەکاردێت و دەیکـەن بـە خـرارو شـەڵتە و گـوریس ورەشـکەو رەشمـاڵ، ئـەم پیـشەیە لەکۆیـە تایبـەت بـوو بەمەسـیحیەکان، کەهەمیـشە خرەکیـان هـەبوو . لبادچـی لـوای سـپی و رەش و سـووری لێـك جـودا دەکاتـەوە، پاشـان بەئامێرێکی تایبـەت پـەرەی دەکـات، کاتێك لواکـە پـەرەکرا دەخرێتـە سـەر چیغێك کەدرێژیکـەی دە مـەترو پانیەکەشـی سـێ مـەترە دەبـوو، کارگـەی لبادچـی دوو جـۆری هەیە، لەچیغ یا لەگونیە دروست دەکرێت شوێنی بگێـر دەبێـت ساڵ دوانزەی مانگ گەرم بێت کاری بگێر زۆر قورسە بە هـەموو کەسـێك ناکرێـت مەگـەر پیـاوی بـەهێزو تەندروسـت و پـشوو درێژ. لەجەم سـەری گونیەکـەوە بەلای پانیـەوە دارێکـی تۆزێك ئەسـتووری بەقـەد خـۆی شـەتەك داوە. لەگـەڵ راخـستنی بەرگنەکـە نـەخش و نیگـاری بـۆ دروسـت دەکرێـت. تـاو نـا

تاوێکیش ئاوی بەسەردا دەپرژێندرێت ، ئینجا بەچیغەوە لوول دەدرێت و بەتوندی بەپەتێکەوە دەپێچرێتەوە ئامادە دەکرێت بۆکوتـان لەلایـەن بگێرەکانـەوە بۆمـاوەی نیوکاتـژمێر، ئینجـا دەکرێتـەوەو دوبـارە لواکـە رێك دەخرێتـەوە، تاهـەموو لبادەکـە بیٚ گریٚ و گوٚلٚ بێت . دوا هەنگاوی ئـەم کـارە ئەوەیـە بۆمـاوەی حەوت کاتژمێر ئەم بەرگنە گـەرم وشـێدار بپەسترێتەوە ، دوای ئـــەوەی دەکرێتـــەوە ، تاوشـــك ببێتـــەوە ، ئینجـــا رادەســـتی خاوەنەکەی دەکرێتەوە

## ((تەمەنێك پڕاوپڕلە هونەر))

(خەنجـــەر پیاودەخاتـــە باوەشـــی مەرەگـــەوە، تـــەمبور (موزیك)زیندوی دەکاتەوە )... رەسولٚ هەمزە توٚف

وەکـو ئەسـتێرەیەك لـەئاسمانی گـۆرانی ومـوزیکی کـوردی هەلٚهات ، بەدرێژای تەمـەنی کەلەهەشـتا سـالٚ بەسـەرەوەیەبیٚ وچان بەقورگ و پەنجەکانی لەگەلٚ تەلەکانی عودەکەی خزمەتی هونەری رەسەنی کردووە. لـەنیوەی یەکـەمی سـەدەی رابـردوو، کەهێــشتا هونـــەر ئــەو بایـــەخ و مەقامـــەی ئێـــستای نـــەبوو، هونەرمەند باکوری دڕی بەتاریکی داو کاروانی هونەری کوردی

ئەم شارەی بوژاندەوە ، ئەوکاتەی قوتابی بووە لە قوتابخانەی کۆیسنجاقی دووەم . مامۆستای وانەی سروود درکی بە دەنگخۆشی ئەو کردبوو، بۆیە بەیانیان لەریز دەرهێنانەوە و سروودی بۆ قوتابیەکان پێگوتوە، ئیدی لەگەڵ گەورەبونیدا حەزو خۆشەویستی هونەر لەگەڵیدا گەشەی کردووە. ئەوکاتانەی بەشداری لەرێورەسمی بۆنە و جەژنەکانی مەسیح دەکات، گوێچکەکانی پردەبێت لەدەنگە سیحراویەکەی (مامەسێوە)و ئاوازی سروودی بۆنەی ئاینی لە سەرەتای تەمەنیەوە حەزی دەنگی (ئەحمەدی حەمەی مەلاو حەمەدەمین کەبابچی و ملا کۆرە)ی پێخۆش بووە لەهەموان زیاتر شەیدای دەنگی هونەرمەندی گەل (تایەر تۆفیق)بووە.

لەم روەوە دەڵێ :تایەرتۆفیق مامۆستای رۆحیم بوو، لەکاتی گۆرانی وتندا، هەوڵم دەدا ئەوم لەبەرچاوبێ لەسەرەتاوە لاسایم دەکردەوە ، لەسەر هەمان رێبازو ستایلی ئەو گۆرانیم دەچری عومرێکی دریژم لەگەڵ تایەر تۆفیق بردە سەر لەکۆیەو هەولێر و بەغدادو تەنانەت تا دواهەناسە لەگەڵیدا بوم.

## ((دامەزراندنی تیپی موزیکی باواجی))

گەرچی باکوری کۆلیجی (دارالمعلمین العالیە)ی تەواو کردووە، بەلأم وەکو پێشتر ئاماژەم پێدا هەر لەمنالّیەوە خۆشەویستی موزیك و گۆرانی هەموو عەقڵ و هەستی داگیرکردبوو ، لەو سالّەی قوتابی دەبێت لەناوەندی کۆیە، بیرۆکەی دامەزراندنی تیپێکی موزیك لە شێوەی تیپی مەولەوی دەکەوێتە سەریەوە ... بۆ خۆ ئامادەکردن و راهێنان لەسەر فێربوونی ئامێرە موزیکیەکان ،ئێواران سەردانی پەیمانگای هونەرە جوانەکان دەکا لە بەغدا، وەکو میوانێك بەهۆی ئەوەی مامۆستایانی پەیمانگا (جەمیل بەشیر)و(غانم حداد)و(حەقی الشلبی) رێگەیان پێدەدا لەو سەردانەیدا فێری ژەنینی ئامێرەکانی (عود و کەمان و جونبوش) بێ ، پاش ئەوەی شارەزایی لەموزیك بەدەست دێنێ لەسالّی ١٩٥٧ ئەوکاتەی لەناوەندی کۆیسنجق مامۆستای زمانی ئینگلیزی بووە،پۆلێك لەو قوتابیانەی خۆی، کەبەهرەی هونەریان هەبوو ، تیپی موزیکی باواجی کۆیە پێك دێنێ، بەدامەزراندنی ئەم تیپەلەدوای تیپی موزیکی مەولەوی بەدووەم تیپی موزیکی دادەنرێت لەکوردستاندا. تیپی موزیکی باواجی لەوکاتەی

دامـەزراوە ، چـەندین چـالاکی هونـەری لەزۆربـەی شـارەکانی کوردستان سـازداوە، دەیـان بەسـتەو مەقامی رەسـەنی کوردی بەتایبـەتی فۆلکلـۆری ناوچـەی کۆیـەی نـویٚ کـردەوە، دواتـر بـەهۆی تێکـچونی بـارودۆخی سیاسـی و ئـەمنی عێـراق و کوردسـتان لـە سـالانی (١٩٦٣تا١٩٧٠)لـە چالاکی و جموجۆلٚ کەوت ،بەلاٚم لە سالی (١٩٧٠) جارێکی تر بە گروتینێکـی نـویٚ هاتـەوە سـەر شـانۆی هونـەری کـوردی هـەر لـەو سـالەدا بـوو جـوانترین ئـاوازو خۆشـترین مـەقام وبەسـتەیان پێـشکەش بـە بینەرو گوێگری کوردکرد، هـەر لەخۆشەویستی خـەلٚکی کۆیـە بـۆ تیپەکـەیان چـەندین چـایخانە و چێـشتخانە و تیپـی تـۆپی پێیان بەناوی باواجیەوە ناونا

# ئاهەنگی ساڵی (١٩٥٧)

ئێوارەی رۆژی ٨ی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٥٧) گەواڵـە هـەورێکی رەش و تاریـك ئاسمـانی شـاری سـلێمانی داپۆشی، لەئەنجامدا بۆ ماوەی سەعاتێك باران بە رێژنـە بـاری، کە بوە هۆی دروست بونی لافاوێکی بێ ئامـان، کـە سـەراپای سلێمانی گرتەوە ، زەرەرو زیانی بە شار گەیاندو دەیان خانوی روخانـد و کەلوپـەلی زۆربـەی دوکانـەکانی سـەر ئاوخـست، تەنانـەت شەپۆلی لافاو ئۆتـۆمبیلی بەسـەر نشینەوە رامـاڵی بـە مەبەستی کۆکردنـەوەی پـارە بـۆ لێقـەوماوانی لافاوەکـە تیپـی مـوزیکی مەولـەوی گەشـتێکی هونـەریان لـە شـارەکانی کوردسـتان دەسـت پێکـرد، یـەکێك لـەو شـارانە کۆیـە بـوو، خەڵکەکـەی پێـشوازیەکی گـەرمیان لـەو تیپـە کـرد، رۆژانـی ١٥و١٦ی تـشرینی دووەم لـە هـۆڵی قوتابخانـەی زانـست تاهـەنگێکی قەشـەنگ رێکخـرا ، کـە تادرەنگـانی شـەو درێـژی کێشا ، سـەرەتا دوو پارچـە موزیکیـان پێشکەش کـرد ، ئینجا کۆمـەڵك گۆرانیبێـژ مـەقام و بەسـتەیان پێـشکەش کـرد، بەتایبـەتی هونەرمەنـدی گـەورە (رەشـۆڵ، کـە بـە دەنگـە خۆشـەکەی ئاسمـانی کۆیـەی پـر کـرد، لـە ئـاوازی رەسـەنی کـوردی و مـەقامی دەشـت وخورشـیدی و بەسـتە هـەرە

خۆشەکەی (ئۆخەی گردەکەی یارە، چەندین شیرین و نازدارە).
لەم بۆنەیەدا مامۆستا باکوری سروودی (لە خەو راپەرە) ی گـووت کۆیـەکان چـەپڵەی زۆریـان بـۆ لێـدا، لـە دوا برگـەی ئاهەنگەکـە هونـەر مەنـدی گـەورە (حەمەسـاڵح دیـلان) بـەدەر کەوت، کە بە چەپڵەیەکی گەرم لەلایەن جەماوەرەوە پێشوازی لێکرا، شیعرەکەی پیرەمێرد (ئەی نائومێدی) بە مەقام چری بەو دەنگە بەسـۆز و جوانـەی ئـەم نـاوەی هێنایـە هـەژان، ئـەو ئاهەنگـە جوڵانەوەیـەکی لـە ناوکۆیـە دروسـت کـرد، خـەڵکی دەست خۆشی زۆریان لە هونەرمەند باکوری کرد و هانیان دا بۆ پێشخستنی تیپی موزیکی باواجی.

## تەسبیح
## لەنێوان کەلەپوورو هاوچەرخێتیدا

کلتوورو بەها نەتەوەیەکانی کورد، تایبەت مەندی خۆیان هەیـــە، زۆر جـــاریش بوەتـــە نیـــشاندانی ســـیمایەکی جیـاواز،کەکوردی لـە نەتـەوەکانی تـر جیـا کردۆتـەوە، دیـارە ئـــەوەی جوانیـــەکی تایبـــەتی لـــە دونیـــای دەرەوەدا هەیـــە، لـــەجوانترین ئەوتایبەتمەندیانـــەش تەســـبیحە ، کـــە بەشـــێکی

زۆری کـوردەواری هەڵیـدەگرن، تەسـبیح لـەو دەنکـە قـەزوان یـاخود مـوورووە رەنگـا و رەنگانـە پێکهـاتووە ،کە جاران وەکـو رەمزێکـــی ئـــاینی بـــۆ نـــزاو پارانـــەوە و زیکـــری خـــودا بـەکارهاتووە...! ئێـستاش خـەڵك بـە دەسـتیانەوە دەگـرن ، بـەهۆی لێراهـاتن و خـوو پێـوەگرتن و جوانیـەوە ووشـەی تەســـبیح لـــە (ســـبحە)ی عەرەبیـــەوە هـــاتووە، مێـــژووی پەیدابونیشی بۆ رۆژگارێکی کۆن دەگەرێتەوە، تەسبیح رەنگی جـۆراو جـۆری هەیـە، دەنکـە سـورو زەرد و سـەوزەکانی دیمـەنێکی جوانیـان لـە هـزری منداڵیمان بەجێهێشتوە. یەکەم دەرکەوتنی تەسبیح لەچین و هیند بووە ، پاشان وردە وردە بە وڵاتانی ئیسلامی بڵاوبۆتەوە

(بۆ تەسبیح هەڵدەگرین)

سـەرەرای بەکارهێنانی تەسبیح لـە بواری خـوا پەرستیدا، خـەڵکی زۆریـش بـەهۆی بێکـاری و بـۆ کـات بەسـەر بـردن بـە دەســتیەوە دەگــرن،هەنــدێکیش بــۆ خۆدەرخــستن و خــوو پێوەگرتنەوە هەڵیدەگرن ، سـەرەرای ئـەو هۆکارانەی سـەرەوە، تەسـبیح لەلایـەن کەسـانێکەوە بـەکاردێ، کەلایـەنی دەرونیـان ئارام نیە، هـەروەها بۆ داپۆشینی لـەرزەی دەست و پەنجـەکان

بەتایبەت بۆ خەڵکانی بەساڵاچوو. تەسبیح هەر لەلایەن پیاوانەوە بەکار نایەت، بەڵکو هەندێك لە ژنانیش بەکاری دێنن، بەتایبەتی وەکو دیکۆر و ئێکسسواری ماڵەکەیان. بەشێوەیەکی گشتی تەسبیح لەناوچە و وولاتە دواکەوتو و ئیسلامیەکان بەکاردێت. جاران و ئێستاشی لەگەڵدابێت حاجیەکان لە گەرانەوەیاندا ژمارەیەکی زۆر تەسبیحیان دەهێبایەوە و بەسەر ئەو کەسانەیان دابەش دەکرد، کە بۆ بەخێرهاتنەوە سەردانیان دەکردن. هەندێك جار تەسبیح هەڵگرتن کێشەو گرفتی بۆ خاوەنەکەی دروستکردووە، بەتایبەتی لە سەردەمی رژێمی بەسەر چوو و رۆژانی شەری ناوخۆدا...!

## ( جۆرەکانی تەسبیح )

لە کوردستان و جیهاندا دەیان جۆری تەسبیح هەیە، بەناوبانگترین جۆرەکانی خۆمان ئەمانەن –ئەبلەقی بەرزنجە و لاسورەو، مامۆستا عەلائەدین سوجادی لە رشتەی مرواریدا ئەبلەقی بەرزنجەی بە نموونەی هەرە جوانی تەسبیح داناوە، بەلأم بەناوبانگترین جۆرەکانی تەسبیحی جیهانیش ئەمانەن:– تەسبیحی کەهرەب، ئەم جۆرە تەسبیحە جگە لە جوانیەکەی بۆ نەخۆشی دڵ و زەردوویی بەکاردێت، کەهرەبیش چەندین

جۆری هەیە ، وەکو (کەهرەبی پۆلۆنی،کەرەنگەکانی زەرد و سورو و تورابی ) کەهرەب چەند رەنگێکی هەیە. تەسبیحی کرمان لەجۆرە بەردێکی تایبەت دروست دەکرێت، زۆر بەنرخە. هەروەها چەندین جۆری تەسبیحی تر هەیە ، وەکو:- یوسر رەنگی رەشە و لە دار پێکهاتوە بەزێر یاخود بەزیو رازاوەتەوە. تەسبیحی نێرجیلْ (کۆك) ئەمەشیان لە دار دروست دەکرێت، هەروەها تەسبیح سەندەلوسی، کە زۆر رەنگی هەیە، ئەو تەسبیحە دەرەکیانە هیچیان نرخیان لە سەد دۆلار کەمتر نیە، هەشیانە زۆر گران بەهایە لەبارەی تەسبیحی قەزوانەوە، وەکو باسمانکرد چەندین جۆری هەیە، شوێنی سەرەکی دروستکردنی تەسبیحی قەزوان، شاخی ئاچداخ و قەرەداخ و ناوچەکانی دۆڵی جافایەتی و بەرزنجەیە. دروستکردنیشی لەلایەن خەڵکێکەوە، کە سەلیقەو شارەزاییان لەم رووە هەیە، لەمانگی تشرینی یەکەمی وەرزی پایزدا کاتێك دارەبەن پێدەگات، دەست دەکەن بەکۆکردنەوەی قەزوان، دوای پاککردنەوەی بە درێشە سێ سوچی قەزوانەکە دەسمن، بەشێوەیەك نەخشی جوانی لە سەر هەڵدەکەنن، پاشان دەداوێکی گونجاو دەیهۆننەوە و گوڵینگەیەکی جوانیشی بۆ هەڵدەبەستن.

## پیاویك لەڕەنگی گوڵ

لەم رۆژەوەی بیری ئازادی و کوردایەتی ئاوێتەی هۆش و هەستی رۆڵەکانی گەلی کورد بووە، لەو کاتەوە تا ئێستا نزیکەی سی شۆرش و راپەرینی دژی داگیر کەرانی کوردستان بەرپاکردوە لەو خەبات سەختە خوێناویانەدا هیچ لایەن و وڵاتێك پشتیوانی لەگەڵ کورد نەکردوە، بەڵکو لە ئاستی نێو دەوڵەتیشدا دژایەتی کراوە. هەر لە بەرئەوە تادوێنێ دەیانگوت لە چیاکان بەولاوە کورد هیچ دۆستێکی نیە...!

وەڵێ بەهۆی کۆڵنەدان و سوربونی کورد لە بەدەستهێنانی مافەکانی و کۆتای هاتنی جەنگی ساردو سیستمی دوو جەمسەری جیهانی و سەقام گیربوونی چەمکی دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ بیروراو سۆزو پشتیوانی گەلێك وولاتی دیموکراسی و کەسایەتی جیهانی بۆ لای خۆی راکێشا. یەکێك لەو کەسە بە هەڵوێست و روناکبیرانەی کە شێلگیرانە پشتیوانی لە دۆزی گەلی کورد کردوە، مێژوونوس و بیریاری گەورەی تورك (ئیسماعیل بێشکچی)یە، ئەو مرۆڤە مەزنە هەر لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی رابردووەوە تا ئەم ساتە وەختەش بەگیانی مروڤپەروەرانەو ئەکادیمیانەوە بە قەڵەم و

کردار بەرگری لە میللەتەکەمان کردوە. بێشکچی لەسەرەتای شەستەکان کە ئەو کاتە سەرباز بوو لە رۆژهەلاتی تورکیا (کوردستان) گەیشتە قەناعەتێك،کەکورد تورك نیە، بەڵکو گەلێکە هەموو تایبت مەندی نەتەوەی خۆی هەیە ، وەکو زمان و مێژوو و کەلتوروو و خاك. لەو رۆژانەوە تاکو ئێستا چەندین کتێب و لێکۆڵینەوەی زانستی لەسەر ئەم مەسەلەیە داناوە کەبە هۆیەوە نزیکەی سی ساڵ تەمەنی خۆی لە گرتوخانەکانی دەوڵەتی پۆلیسی تورکیا بەسەر بردوە . بێشکچی بەپێچەوانەی میتۆدی باوی ئەوسای زانکۆکانی تورکیاو رەوتی رۆژنامەگەری تورك،کەهەمیشە بەلای سیاسەتی دەوڵەت دەشکانەوە، ئەوهەڵوێستێکی جیاوازی پەیرەو دەکرد، هەموو کردەوە وەحشی گەریەکانی رژێمی تورکیای دەرهەق بە گەلی کورد ریسوا کرد پەردەی لەسەر هەڵماڵی لەنامەیەکدا بۆرێکخراوی (یونسکۆ) دەڵێت

(کوردستان کۆلۆنێکی نێو دەولەتی دابەشکراوە لە نێوان چەند وولاتێکی رۆژهەلاتی ناوەراست، ئەو گەلە مافە مرۆیی و نێومرۆییەکانی لێ زەوتکراوە، بەتەلی درکاوی و مین و رەبیەی سەربازی ئەو گەلەیان لە یەکتر دابریوە. ئەم وولاتانە بۆئەوەی درێژە بە داگیرکردنی کوردستان بدەن، هاوکاری و هەماهەنگی یەکتردەکەن، ئایا گەلێك ژمارەی دانیشتوانی سی ملیۆن کەس

بێت شایەنی سەربەخۆی و پێکهێنانی دەوڵەتی خۆی نیە؟ لێگەرێن با ئەو گەلە خۆی حوکمرانی خۆی بکات، جارێکیان لەوەڵامی پرسیاری رۆژنامەنوسێك بەو شێوەیە دەدوێت: (تورکیا زیندانێکی گەورەیە، جیاوازی چیە ئەگەر تۆ لەناو ژوورە تاریکەکانی گرتوخانە دابی، یاخود لەدەرەوەیدا بژی ) لەساڵی (١٩٦٨) دا بەژداری زۆربەی خۆپیشاندانەکانی ناوچە کوردنشینەکانی وەکو،(دیاربەکرو ئاگری) کردووە کەدژی سیاسەتە چەوتەکانی رژێمی داگیرکەری تورك ئەنجامدەدرا. ئاشکرایە ئەوەی ئەو راستیە بەر جەستە دەکات، کە بێشکچی هەر بەتەنها لەرێی نوسینەکانیەوە بەرگری لەدۆزی رەوای کورد نەکردووە، بەڵکو بەکردەوەش ئامادەبووە گیانی خۆی بخاتە مەترسیەوە . بێشکچی تاکو ئەمرۆ زیاتر لە بیست کتیبی سەنگینی لەسەر کورد نوسیوە،کەبەدەگمەن هەڵدەکەوێ لەناوخۆشماندا نوسەرێك هەبێ ئەوەندە بەرهەمی لەسەر گەلەکەی خۆی نوسیبێ...!! لێرەدا بەشێك لەو کتێب و لێکۆڵینەوانە دەخەینە بەر دیدی خوێنەری کورد، تابۆی روون بێتەوە ئەو مرۆڤە چ کۆشش و قوربانیەکی لەپێناوی ئێمە داوە.

١-لێکۆڵینەوەی خۆپیشاندانەکانی خۆرهەڵات لە ساڵی (١٩٦٧) نوسیوە.

٢-خێڵە کۆچەرەکانی کوردستان و پەیوەندیەکان لە ساڵی (١٩٦٨) نوسیوە.

٣-میتۆدی زانستی چۆنیەتی بەکارهێنانی لەتورکیا و راگوێزانی کوردان لە ساڵی (١٩٧٧) نوسیوە.

٤-کوردستان کۆڵۆنێکی نێو دەوڵەتیە، لە ساڵی (١٩٩٠ )نوسیوە.

٥-سایکۆلۆجیای رەسمی دەوڵەت و دیموکراسی کێشەی کورد، لەساڵی (١٩٩٠) نوسیوە.

٦-مەرجەکانی سەرهەڵدان، لە ساڵی (١٩٩٠) نوسیوە.

٧-رامان لەسەر روناکبیری کورد، لە ساڵی (١٩٩١)نوسیوە.

٨-تیرۆری دەوڵەتان لەخۆرهەلاتی ناوەراست، لە ساڵی (١٩٩٠) نوسیوە.

لە کۆتای ئەم پەیڤانەی سەرەوە بۆرێزلێنان لە کەسایەتی و خەباتی ئەم مرۆڤە مەزنە پێشنیاز دەکەم بەشێك لە نوسینەکانی لە قۆناغەکاندا بخوێندرێت و تا زیندوشە پەیکەرێکی شایستەی لە شاری کەرکوك بۆ دروست بکرێت، ئەوەش وەفاداریەکی گونجاوە بەرامبەر ئەو پیاوە تێکۆشەرەی کە لە دژی دەسەلاتدارەکانی خۆشی ئیشی بۆ نەتەوەی کورد کردووە .

سی ساڵ لەمەوبەر خوێندکاری ئامادەیی (الاخوە) بووم لە هەولێر ،بەبۆنەی جەژنی نەورۆز ،ئاهەنگێك لە گۆڕەپانی تۆپی پێی هەولێر سازکرا، ژمارەیەکی زۆر لە دەسەڵاتدارە کارتۆنیەکەی ئەوساو جەماوەرێکی زۆری شاری هەولێری خۆراگر ئامادە بوون، دوای چەند برگەیەك لە ئاهەنگەکە، نۆرە هاتە سەر گۆرانی بێژی نەمر (تایەر تۆفیق)ن لەگەڵ دەرکەوتنی لەسەر شانۆ ،بە چەپڵەو هەرا پێشوازی لێکرا. (خاڵە تایەر) وەك گشت لایەك دەزانن کردبویە نەریتێکی جوان ،لەزۆربەی ئەو ئاهەنگانەی بەژداری تێدا دەکرد بە مەقامە بەناوبانگەکەی(شیرین بەهارە)ی دەچری. ئەوەبو لەوبۆنەیەشدا ئەو شیعرە جوانە، بەودەنگە بەرزو بەسۆزە ، بەچریکەو لەرینەوەی ژێکانی قورگی، ئامادە بوانی هێنایە جۆش و خرۆش و وروژان پێم وابوو، گوتنی شیرین بەهارە بەو شێوازە، دەربرینی هەست و نەستی پەنگ خواردوی ناخی هونەر مەند بوو،بەرامبەر ئەو بارو زروفەی رۆژانی دوای هەرەس، دەیان جار گوێم لەو مەقامە گرتووە، بەلأم هەرگیز وەکو ئەوجارە داهێنانی تێدا نەکردبوو.

## هونەرمەندی بەهەڵوێست

تایـــەر تۆفیـــق هونەرمەنـــدی هـــەموو کوردســـتان بـــوو، پێچەوانەی زۆربەی هونەرمەندانی دیکە، کە هەر لەناوچەیەك، یـاخود لەپارچـەیەکی کوردسـتان گـوێگرو جـەماوەریان هەیـە ،لایەنێکی تری خاڵە تایەر ئەوەبوو، کەبەشێکی زۆر لەسامانی فۆلکلۆری کۆیە و دوروبەری لەگۆرانی و بەستەو مەقام زیندوو کردەوە. هونەر مەندی گەورە قوتابخانەیـەکی هونـەری بـوو، بۆ فێربوونی وانەکانی هونەری ڕەسەن و هەستی کورد پـەروەری، بەدەگمەن هونەری بەرزو کەسایەتی و نەفس بەرزی و رەوشتی جوان لەهونەرمەندێکا کۆ دەبێتـەوە ، وەکو لەتایـەر تۆفیـق کۆ ببـۆوە..!!! بـاکوری هونەرمەنـد لـەزاری مـشکۆی هـەولێری دەگێرێتەوەو دەڵێ: جارێکیان هونەر مەندی نەمر تایەر تۆفیـق بەژداری ئاهـەنگێکی گـەورەی لەشـاری دهـۆك کردبـوو، لـەکاتی گۆرانی گوتندا، چەند کەسێك چوبوونە سـەر شـانۆ پارەیـەکی زۆری دەیی و پێنجیان بەسەر دا باراند بوو . بەشێوەیەك سـەر شانۆکە پر ببوو لە پارە ،بەلام ئەو هەر ئاوری لـەم پـارە زۆرە نەدابۆوە، کـاتێکیش گۆرانیەکـەی تـەواو کـرد ، یەکسەر چووە خوارەوە و لەشوێنی خۆی دانیشت،(مشکۆ) لە گێرانەوەی ئەو رووداوە بەردەوام دەبێ و دەڵێ: دڵنیا بووم(تایـەر) لـەم رۆژەدا تـەنیا پێـنج دیناریـشی لـەگیرفان نـەبوو...ارژێـم فـشاری زۆری

بۆدەهێنا بۆئەوەی بەسەر قادسیەدا سرودێك بڵێ ، بەڵام ئەو هەرگیز ملی بۆ ئەو فشارو سەیارە و پارە و پولە دانەنواند...!
ئەو تا مردیش هەر لەبەرەی گەلدا بوو. لەورۆژەوەی یەکەم گۆرانی بەناوی(نیوەشەو) لە گوریێ لەسورەگوریێ و بەستەی کراس زەردیێ و لەئێستگەی کوردی لەبەغدا بڵاوکردەوە ، تا دوا گۆرانیشی کە بەناوی (جیهانم پشکنیوە) لە مەقامی (سەبا) لە ساڵی ١٩٨٧ تۆمار کرد ، هەر سەر مەشق و پێشەنگ بوو، گۆرانیو بەستەو مەقامەکانی لەئاستێکی بەرزی هونەری دا بوون، نزیکەی نیو سەدەن تەنانەت لەدوای مردنیشیدا مەقام و گۆرانیەکانی وێردی سەر زاری خەڵکی کوردستانن. بە کۆچی دوای ئەو کەڵە هونەرمەندەی گەلەکەمان لە(١٩٨٧/١٠/٢٠) هونەری گۆرانی کوردی یەکێك لە ڕەمزو ئەستێرە هەرە درەوشاوەکانی لەدەست چوو.

دوای سەرکەوتنی شۆرشی بەلشەفیك لە ڕوسیا (١٩١٧) نوسەری ناسراوی ئینگلیزی (ئیچ جی ویڵز) سەردانی روسیای کرد، لە (کرمیلین) چاوی ڕێبەری شۆرشی روسی (لینین) کەوت، لەم دیدارەدا (لینین) باسی لەگەیاندنی کارەبا و ڕێگا بۆ هەمووبستە خاکێکی روسیا کرد بوو، لەبیست ساڵی ئایندەدا، کە ئەو دەم ڕووبەری خاکی رووسیا خۆی لە(١٥) ملێۆن کیلۆمەتر چوارگۆشە دەدا. لە گەرانەوەی بۆ بەریتانیا لە نوسینێکدا (لینین) ی بەو پیاوە وەسف کردبوو، کە (ورێنە) دەکات چونکە نوسەری ناوبراو هەرگیز بڕوای بەو قسەیەی (لینین) نەدەکرد، کە ولاتێکی وا پان و بەرین و دواکەوتوو و ئابلۆقەدراو لەلایەن ولاتانی رۆژئاواوە، ئەو خەونەی بێنێتە دی!! ساڵ هاتوو چوو ، دوای یبست ساڵ لەو چاوپێکەوتنە، نوسەری ناوبراو جارێکی تر سەردانی روسیای کردەوە ، بەلام ئەم جارەیان بۆی روون بۆوە، کە قسەکەی (لینین) ورێنە نەبوو. بەڵکو خەونێکی شۆرشگێرانە بوو هاتەدی گێرانەوەی ئەم بەسەرهاتە تەنیا بۆ دەرخستنی راستیەك بوو، کەفاکتەری (کارەبا و ڕێگا) رۆڵی چەند مەزن لەژیانی شارستانی و پێشخستنی ئابوری گەلان دەگێرن ، بەتایبەت لە قۆناغی بنیادنانەوەو ئاوەدانکردنەوەدا. کوردستان خاوەنی خاکێکی

بەپیت و ئاو هەوای سازگار و کەرەستەی خاوە بۆ ئەنجام دانی پرۆژەی کشتوکاڵی و پیشەسازی ، بەڵام رژێمە داگیرکەرەکانی یەك لەدوای یەکەکانی بەغدا ، هەمیشە هەوڵیانداوە وڵاتەکەمان بەدواکەوتوویی بمێنێتەوە، ئەگەر لێرە و لەوێ پرۆژەیەکیشیان جێبەجێ کردبێ ، ئەوا لەپێناو مەرامە گلاوەکانیان بووە ، یەکێك لەو پرۆژانەش کە لەم ناوچەیە ئەنجامدراوە و خەڵك هەردەم بە نموونەی کاری سەرکەوتوو باسی دەکەن ، رێگای هاتو چۆی نێوان (کۆیە و تەق تەق )ە ئێستا پتر لەنیو سەدە بەسەر دروستکردنیدا تێپەریووە، کەچی هێشتا لەم رێگا نوێانە چاکترە. کە هەندێکیان پاش چەند مانگێك کەموکوریان لێپەیدا دەبێت! دروست کردنی رێگایەکی نوێ لە(کەرکوك بۆ تەق تەق بۆکۆیە و قەڵادزە) دەبێتە هۆی بوژاندنەوەی بازرگانی و کشتوکاڵی ناوچەکە. راستە رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان لە دروست کردنی ئەم رێگایانە ئامانجی لەشکرکێشی و رەگەزپەرستیان لە پشتەوە بووە ، بەڵام خەڵکی کوردستان سودیان لێبینیوە، بەتایبەتی لە دوای راپەرینەوە بۆ ئاوەدان کردنەوەی لادێکان و هاتوچۆکردن درێژی رێگاکە سێنزە کیاۆ مەترو نیوە. بۆیە بە تێپەڕ بوونی پەنجا ساڵ بەسەر ئەو پرۆژەیەدا . لە کلاو

پۆژنـــەی مانگانـــەی (هـــامون)ەوە، پێمـــان باشـــبوو ، چـــەند تیشکێکی بخەینەسەر.

بەر لـە هـەر شـتێك دەبـێ ئـەو راسـتیە لـە بەرچاو بگـرین ، سەرکەوتنی ئەو کارەش بۆ رۆڵـی سـێ ئەنـدازیار دەگەرێتـەوە، کە زۆر بە دڵسۆزی و دوور لە هەر دەستکەوتێکی تایبـەت ئـەو پرۆژەیـان جێبـەجێ کـرد، ئـەو ئەندازیارانـەش ناویـان(شـێخ سەعید، رەشـید میران، صـالح)بوو. رێگاکـە لـە سـاڵی (١٩٥٥) دەستی پێکراو لە ساڵی (١٩٦٠) تەواو بووە. لایەنی جێبـەجێ کـاریش (الـشرکه العربیـه للهندسـه والا عمـار) بـوو، کـە کۆمپانیەکی سوری بوو، خاوەنەکەشـی نـاوی (احمدالشربانی) بـوو، ئـەو پیـاوە لـە عەربـە رەگەزپەرسـتەکان بـوو، هـەردەم بەچاوێکی سوك سەیری مرۆڤـی کوردی دەکـرد لـە سـەرەتای کارەکـەی بـە هەنـدێ ئـامێری سـادە دەسـتی پێکـرد،بـەلاّم لـە قۆناغـەکانی دواتـر کۆمـەڵێك ئـامێری نوێـان هێنایـە سـەر کـار وەکو،چوار ئامێری یوکلّت وسەکرینەرێك بۆ زەوی هەڵکەندن و خۆڵ گواستنەوە . بلدۆزەرێك چوار قەلابە و شەش عادیلە و چـوار کەسـارە بـۆ بـەرد وردکـردن ، پرۆژەکـە لـە یانـەی فەرمانبەرانی کۆیە دەستی پێکرد و لە روبـاری کۆیـە کۆتـای هـات ، لـە سـەر ئـەو رێگایـە پردێکـی گـەورە دوانـزە قەنتـەر دروستکرا بە درێژای سالأنی کارکردن رۆژی دوسەد کرێکـاربۆ

ماوەی هەشت کاتژمێر کاریان تێدا دەکرد. ڕۆژانەی کرێکاران ٢٥٠بۆ ٣٠٠ فلس بوو و زۆربەیان خەڵکی کۆیەو هەرمۆتە و تۆبزاوا و داربەسەر و شیلەو شیواشۆك و شیوەجان بوون، لە بەرنەبونی ئۆتۆمبێل کرێکارەکان بە پێیان یاخود بە کەرو وڵاخ دەچوونە سەر کارەکە. کارگەی قیرەکە لە سەر ڕێگای شیلە داندرا بوو، ئەستوری قیرەکە پانزە سانتیمەتربوو. بە درێژایی ماوەی کارکردن تەنیا سێ مانگ کارەکە وەستێندرا، ئەویش بە هۆی شۆڕشی چواردەی تەمموزی (١٩٥٨) ەوە بوو، کاتێکیش کەوتەوە کار ، نا کۆکی کەوتە نێوان کرێکاران و خاوەن کۆمپانیاکە، چونکە کرێکارەکان داوای کرێی ئەو سێ مانگەیان دەکردووە ،بەڵام کۆمپانیاکە ملی بەو داوایەیان نەداوە، لە ئەنجامدا لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون، کە نەشیش بسوتێ و نە کەباب، بە گوێرەی ئەم ڕێککەوتنە کرێکارەکان تەنیا یەك مانگ و نیو وەربگرن لە نیوەکەی دیکەش خۆش بوون، بە هۆی بارو دۆخی ئەو سەردەمە. کۆمپانیاکە ئیفلاسی کرد. واتە پرۆژەکەی سەد لەسەد جێ بەجی نەکرد

تێبینی: بۆ نوسینی ئەم بابەتە زۆر سودم لە زانیاریەکانی کاك (فەتاح برین پێچ) وەرگرت

# بۆ ئەوەی خونچەکان جوانتر بگەشێنەوە

رووی قسەم لەو مرۆڤە دڵڕەق و درندانە نیە، ئەگینا لە هیچ کۆمەڵگەیەکی گەشەکردو کەسێك بەدی ناکەی، کە بە بینینی منداڵ دڵخۆش و شاگەشکە نەبێت، روخساو سیمای منداڵ هەمیشە وێنەی ئەوشکۆفەیەمان بیر دێنێتەوە، کەتازە بەدەم هەودا زێڕینەکانی خۆری سپێدەی وەرزی بەهاران پێدەکەنێ... زۆر جار ئەندێشە دەمگەڕێنێتەوە لای رۆژە دۆزەخەکانی ئەنفال، بۆ لای ئەو منداڵە ساوایەی دوای چەندین رۆژ دابڕان لەسۆزی گەرمی دایکی بە گاگۆڵە ڕووەو باوەشی دایکی دەخشێ، لە ناکاو(حەجاج)ی ئەهریمەن، قاچی دەخاتە سەر دەمی هەڵیناگرێ، تا روحە پەپولەییکەی جیا دەبێتەوەو دەچێتە بەر قاپی خودا... سەیرم پێدێ خواوەند چۆن لە ئاست ئازاردانی منداڵ بێدەنگ دەبێ...؟؟ گومانی تێدانیە تەمەنی منداڵی جوانترین و پاکترین ماوەی تەمەنی مرۆڤە، چونکە کەسایەتی مرۆڤ هەر لەو قۆناغەدا ڕەگ و ڕیشە دادەکوتێ، دواجار هەر لە سەر ئەو بناغەیە گەشە دەکاو گەورە دەبێت، کە ڕەنگدانەوەی ئەو شێوازی پەروەردەکردنەی خێزان و قوتابخانە و کۆمەڵگەی بە سەرەوە دیارە لەبەر هەستیاری

ماوەی منداڵی و بۆ پێگەیاندنی منداڵ بەشێوەیەکی جوان، تا لەئایندەدا ببێتە ئەندامێکی سود بەخش. هەموو کۆمەڵگە شارستانی و پێشکەوتووەکانی جیهان لە هەوڵی بێوچاندان لە پێناو دامەزراندنی کەشێکی گونجاو تا لەسایەیدا منداڵێکی ساغ و خاوەن کەسایەتی لێ بێتە دی لە وڵاتانی جیهانی سێیەم و هەژاردا. منداڵان لە سەخترین دۆخدا دەژین، ئێستا ملیۆنەها منداڵ لەژێر هەڕەشەی برسێتی و مەترسی شەری ناوەخۆ دەناڵێنن و بێبەش بوون لە خوێندن و هتد... منداڵانی کوردستانیش بەهۆی شەڕەکانی ناوەخۆ و دەربەدەری، هەزارانیان بێبەش بوون لە سۆزی خێزان و پەروەکردنی ڕاست و دروست هەموومان دەزانین منداڵی ئەمڕۆ، نەوەی دوارۆژی کۆمەڵگەن، بۆیە پێویستە لەسەر حکومەتی هەرێم، ئاورێکی چاکتر لە منداڵان بداتەوە. هەوڵی سڕینەوەی ئاسەوارەکانی شەری ناوەخۆ و ئەنفال بداتەوە، بەڵام بەداخەوە وەزارەتە تایبەتمەندەکان و بەرپرسانی ئەم شارە بایەخێکی جدیان لەم لایەنە نەداوەتەوە، تاکە دەزگای میری بایەخ بەمنداڵ بدات، بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیری منداڵانی کۆیەیە، کەساڵانە دەیان خولی جۆراو جۆر لە بوارەکانی: میوزیك و شانۆ و کۆمپیوتەر و وێنەکێشان و هتد...دەکاتەوە. لەم روانگەی سەرەوە پێویستە پارك و شاری یاری منداڵان دروست بکرێت، چەند یاریگایەکی

بچووكی (تاتان) لە هەموو گەڕەكەكانی شار دروست بكرێت، چەند خانەیەكی رۆشنبیری منداڵان دروست بكرێت، تامنداڵان پەرە بە خولیاو ئارەزووەكانیان بدەن. سەرڕای ئەوانە دروست كردنی چەندین قوتابخانەی نوێ، چونكە هەنووكە قوتابخانە هەیە دوو تا سێ دەوامی تێدا دەكرێت، ئەوەش وایكردوە منداڵان وەكو پێویست سوود لە وانەكان وەرنەگرن، بە هۆی قەرەباڵغی و جەنجاڵی پۆلەكانەوە.

## ئەو رۆژانەی قەت لە رۆژانی تر نەدەچوو...!

لە ژیانی هەموو گەلێكدا، وێستگەیەكی مێژوویی و گرینگ هەیە، كە دەبێتە خاڵی وەچەرخان و جیاكەرەوە لە مێژووی ئەو گەلەدا، ساڵانە یادی دەكاتەوە و ئاهەنگی بۆ دەگێڕن ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی (١٩٩١) ئەو ڕوداوە مەزنە بوو، كە وەچەرخانێكی گەورەی لە مێژووی كوردا دروست كرد. ڕاپەڕین تەقینەوەی بێزاری و ڕقی جەماوەری كوردستان بوو دەرهەق بەزوڵم و ستەمی ڕژێمی ڕەگەز پەرستی بەعس دوای داگیركردنی كوێت لە لایەن هێزە سەربازیەكانی عێراقەوە، سەركردایەتی (ی.ن.ك) بە خوێندنەوەی ووردی ڕووداوە ئیقلیمی و جیهانیەكان، گەیشتە ئەنجامێك كە كۆمەڵگەی

جیهانی له ئاست ئەو ڕووداوه ترسناکه قسەی خۆی دەبێ..
بۆ ئەم مەبەستەکەوته خۆ ڕێکخستنەوەو جۆشدانەوەی شانه
نووستوەکانی شارو ئۆردوگا زۆرەملێکان، لەو لاشەوه تا
دەهات تەنگژه ئابوریو سیاسیو کۆمەڵایەتیەکان تەوقی ملی
ڕژێمی بەعسیان توندتر دەکرد، له ڕۆژی ١٩٩١/٣/٥ دا پەتی
زوڵم و ستەمی بەعس له بەردەم هەژموونو هەڵمەتی ڕۆڵەکانی
گەل پسا.

سەرەتا لەڕانیەی قارەمان بڵێسەیدا، ئینجا ڕۆژ له دوای
ڕۆژ ئەو ئاگره پیرۆزه تەشەنەی کرد، تا گرەکەی هەموو
جەستەی بەعسی لەکوردستان کرده خۆڵەمێش.. شاری کۆیه،
که مەڵبەندی کوردایەتیو شەهید پەروەرانه، هەروەکوچۆن
هەمیشه سەرقافڵەو پێشەنگی کاروانی کوردایەتی بووه، لەو
ڕۆژەشدا که قەت له ڕۆژانی تر نەدەچوو له بەرەبەیانی ڕۆژی
١٩٩١/٣/٩ هاوڕێیانی شەهیدان دڵشادو ئاودێرو شەهریارو
مشیرو هتد... هەڵمەتیان برده سەر مۆڵگەکانی ڕژێم، له
داستانێکی دەگمەندا قرمەژنی گوللەی پێشمەرگه هاوارو
نەعرەتەی جەماوەر، تێکەڵ ڕێژنه باران دەبۆوەو تا له ئێوارەدا
لەگەڵ زەردەپەر پانۆرامای سەرکەوتنی ئازادی بەسەر
کۆتەڵەکەی حاجی قادردا تۆمارکرا.. هەڵبەته هەق دەسەندرێ،
نادرێ، سەندنەوەی هەقی ئازادیش هەرخوێنه، له
خەنەبەندانی ڕۆژی ئازادی کۆیەدا، شازده پێشمەرگەی

قارەمان‌و شانە چەکدارەکانی بروسك شەهید بوون، بۆ یادی ئـەو رۆژە مەزنـە، ڕۆحـی پـیرۆزی ئەوشـۆڕە سـوارانەی، کـە بەخوێنی خۆیان لاپەرەیەکی گەشی ئەم شارەیان نوسیەوە ، وا لە خوارەوەدا ناویان تۆمار دەکرین:-

ناوی شەهیدان:

١-جەوهەر حەوێز حەمکۆڵ.

٢-احمد عوسمان حوسێن.

٣-جاسم فەرحان حمد.

٤-سەعید سالح لەتیف.

٥-سوارە عومەر حمد.

٦-تۆفیق ڕەسوڵ تۆفیق.

٧-تۆفیق تەها احمد.

١٨-براهیم حسن مەلا.

٩-ئاکۆ کەریم حمد.

١٠-جەنگی اسعد عبدالله.

١١-کاوە حمد لمین.

١٢-محمد عباللە امین.

١٣-میرزا فەتاح مەعروف.

١٤-ئاسۆ خالید.

١٥-کامەران حوسێن سەبوح.

سلاو لە هەموو گیانی پاکی شەهیدانی کوردستان

# نیگایەك بەسەر مێژووی سینەما لە كۆیە

دمێكــە ســینەما لــە وولأتــە پێــشكەوتووەكاندا بــووە بــە هونــەرێكی زینــدوو ، وێـرای ئــەوە فاكتــەرێكی گرینگیــشە بــە ئاراستەی پێكەوە ژیانو ئاشنابوون بە كەلتورو ڕۆشنبیری و داب و نــەریتی گــەلانو لــەم ڕۆژگــارەدا پیــشەسازی ســینەما سەرچاوەیەكە بۆ بەدەستهێنانی داهاتێكی گەورەی ئابووریو سیاسیو گەشتیاری، بۆ نموونە (كۆمپانیای والّت دیزنی)، كە كۆمپانیایەكی مەزنی بواری ڕاگەیانـدنو بەرهـەمهێنانی ڤیلمـە لــە ئەمــەریكا داهــاتی ســالأنەی ئــەو كۆمپانیایــە خــۆی لە(٣٥)ملیار دۆلار دەدات.

لەروانگـەی سـەرەوە گـەلانو وولأتـانی پێشكەوتوی دونیـا هــەموو ســالّێك ڤیــستیڤالّی ســینەمایی ســازدەكەن، وەكــو ڤیــستیڤالّە ســینەماییەكانی(گولّــدن گلّــۆپ)و (ڤینیــسیا)و (قاهیرە)و دەیان ڤیستیڤالّی تر.. سەرهەلّدانی هونەری حەوتەم وەكـو ڕووێكـی گەشـتیاری و ژیـاری مرۆڤایـەتی لـە سـەرەتای سەدەی ڕابردوەوە سیماكانی بەدەركەوت لەگەلّ بلأو بونەوەو گەشــەكردنیدا ، هێــدی هێــدی كاریگــەری لەســەر كوردســتان دیاریدایــە، بـۆ ئاگـاداربوون و بـە دەسـتهێنانی زانیـاری لەمـەڕ

پەیدابوونی سینەما لە کۆیە دەبێ نیو سەدە بگەڕێتەوە دواوە بەم شێوەیەی خوارەوە:-

قۆناخی یەکەم:- لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا واتە لە سالأنی( ١٩٥١-١٩٥٣ ) دەست پێدەکات ،ئەوکاتەی وزەی کارەبا نەگەیشتبوە کۆیە، ئەودەم بەشی هەواڵگەری سوپای بەریتانی و ئەمەریکی سینەمایەکی گەڕۆکیان بۆ ئامانجی پڕوپاگەندە کردن دژی ڕژێمی کۆمەنیستی دامەزراند، سینەماکە فیلمی هەمەجۆرو شەڕو شۆڕو ململانێ و پاك‌و خاوێنی خۆپاراستن لە نەخۆشیەکانی نمایش دەکرد.

سینەماکە لە سەنتەری شار بوو لەتەك کۆتەڵەکەی حاجی قادری نەمر، کە ئەو دەم هێشتا دانەمەزرابوو ،شاشەکەی بریتی بوو لە پارچە قوماشێکی خامی سپی ٢بە ٢/٥م بە ڕوکاری پێشەوە سەرای کۆیەوە بوو، پیشاندانی فیلم تەنیا لە کاتی شەودا بوو، خەڵك بە چوار مەشقی یاخود بەسەر پێیانەوە سەیری ڕووداوی فیلمەکانیان دەکرد، ئەوکات چوون بۆ سینەما بە خۆرایی بوو،بزوتنەوەی چەپ لەو سەردەمەدا ڕۆڵی سەرەکیان دەبینی لەسەر گۆڕەپانی سیاسی شارەکەدا ، هەڵبەتە ململانێی توند لە نێوان ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات هەبوو، بۆیە شیوعیەکان لە شەوێکدا نارنجۆکێکی (مۆڵۆتۆف) یان

هەڵدایەوە ناو ئەو خەڵکە.. خۆشبەختانە هیچ زیانێکی نەبوو، بەڵام بەهۆی دەنگی بەرزی تەقینەوەکە کەس نەبووە برای کەس نەبوو.. هەر یەکێك لە ویستی خۆ دەربازکردندا ەبوو.. ژمارەیەك لەو خەڵکە کەوتنە ناو ئەو قوڵتەوە، کەبە ئاراستەی شەقامی سەرا بۆ ئاوەڕۆ هەڵکەندرابوو،کەپڕ لەقیڕی توەبوو ئیتر ئەو نارنجۆکە بووە دوابزماری سەر تابووتی لە ساڵی ١٩٥٨.

قۆناخی دوەم :- یەکەمین هەوڵی خۆماڵی بۆ دانانی سینەما لەم شارە لەلایەن(حەوێزی مام یەحیا) لە ساڵی ١٩٦٧ دا بوو، سینماکانی لە (گۆرەپانی ئامێرەکانی شارەوانی) دانا، ریکلام و پڕوپاکەندە بۆ فیلمەکان کاك (عەزیز سەربەست)و (حمە بەگرەن) پێی هەڵدەستان، چەند دیمەنێکی فیلمەکەیان لەسەر بۆردێکی گەورە دادەناو بە شەقامی سەرەکی شار دەیانگێڕا ،نرخی بیتاقە(تکت)ی چوونە ژوورەوە بە (٦٠) فلس بوو، شوێنە تایبەتیەکانیش(لۆج) بە (٧٥٠) فلس بوو، ئەفسوس دەستی ئاژاوە لە کاتژمێر ٩/٥ی شەو نارنجۆکیان هەڵدایە ناو سینەماکەوە، کە بووە هۆی بریندار بوونی چەند کەسێك لەوانە:- نوری حەمە کەریمو دلێری وەستا محمەدی دارتاش و چەند کەسێکی تر ، ئەم ڕووداوە بوە هۆی مردنی خاوەن سینەماکە ،بە وەش ئەم هەوڵەیان لە ناو برد، بەڵام

کاك(عەلی ڕابیە ڕەش) خاوەنی ستۆدیۆی چنارۆك ئامێرو کەل‌و پەلەکانی سینەماکەی کڕیەوەو شوێنەکەی بووبە گازینۆکەی سەعید مەلا ئەحمەد، کە ئیستا پێشانگای ئۆتۆمبیلەو کەوتۆتە بەرامبەر قایمقامی کۆیە، ئەوەی مایەی تێرامانە لەو بارودۆخە تا جێگیرەی ئەوسای ساڵی ١٩٦٨دا دەیان خیزان دەچوونە سینەما، ئەو فیلمانەی، کە لەوێ نیشان دەدران زۆربەیان فیلمی هیندی‌و میسری‌و ئینگلیزی بوون، یاخود تەڕەزان‌و هەرقل‌و ئەمیر ئەرسەلان بوون، مەخابن ئەو هەوڵانە ئەگەر چی سەرەتای بوون، بەلآم بەهۆی کۆمەڵێك هۆکار نوشستیان هێنا، لەوانە نائارامی ڕوشی سیاسی‌و هەژاری و نەداری خەڵك و ڕۆڵی کۆنە پەرست و ئاژاوەگێران ، هەموو ئەو فاکتەرانە ڕۆڵیان گێرا ، لەوەی کە سینەما لەم شارە نەش و نما نەکات و پێش نەکەوێ ، بەڵکو لەناویش بچێ.

## نەخشەی ڕێگا

### پێشەکی:-

زۆر لە کۆنەوە مرۆڤ بایەخی بەڕێگاو بان داوە، لەگەڵ پێشکەوتن‌و بلآوبونەوەی ئاژەڵداری‌و کشتوکاڵ‌و پیشەسازی ئەوەندەی تر ڕێگاوبان بووە جێی بایەخی مرۆڤ لە ئەنجامی شۆڕشی پیشەسازی ئەوروپادا، گەلانی ولآتانی ئەوروپا

لێبراونەتر بەدوای بازاڕدا دەگەران بۆبە دەستهێنانی هێزی کاری هەرزان و بازاری نویێو کەرەستەی خاوی زیاتر دەوڵەتی عێراقی نوێ کە لە ساڵی(١٩٢١) بەشێوەیەکی ناسروشتی لە دایك بوو، کەم تا زۆر بایەخی بەراکێشانی تۆڕی ڕێگاوبان دا، بەلأم لە کوردستان لە گۆشە نیگای سەربازیو شۆڤێنیەتەوە ڕێگاوبانی ئەنجام دەدا،ڕێگەی ستراتیژی(هاملتۆن) کە پاشان هەر بەناوی ئەو ئەفسەرە ئینگلیزەوە ناوبانگی دەرکرد، کە نەخشەو پلان داڕێژەری ڕێگاکە بوو.

ڕێگەی کۆیە- بێستانەش کەلە نیوەی دووەمی چرخی رابردوو جێبەجێ کرا، لە ڕێگا سەرەکیەکانی کوردستان ئەژمار دەکرێت پێش ئەوەی ئەم ڕێگایە دروست بکرێت، دانیشتوانی شاری کۆیە بە پیادەو کەرو بار هاتوچۆی ئەودیویان دەکرد، ئاشکرایە زنجیرەچیای هەیبە سوڵتان بەربەستێکی سروشتی سەخت بووە، لە بەردەم ڕێبوارو کاروانچێە کاندا، بۆیە مرۆڤ لەچەند خاڵێکەوە توانیویەتی ئەو چیایە ببڕێت، کەئەمانە بوون:-

١-ڕێگای گڵەڕەش – چناروک مەلایان.

٢-ڕێگەی کافرۆشیان – چناروک بڵباسان.

٣-دەرکی خۆشناوان – گەرووی میرسەید.

٤-ڕێگەی حەمامۆك – گەروی حاجیلان.

ڕۆژگارێـك كۆیـە شارۆچـكەیەكی بـچووك بـووە، بـەهۆی خراپیو سەختی ڕێگاكانیەوە، بەتایبەت لەوەرزی بەفربارینندا، هاتوچـۆی نێـوان كۆیـەو دەوروبەرەكـەی ئەسـتەم دەبـوو، لەبەرئـەوە هـەر مـاڵێكی ئـەم شـارە لانیكـەم ئـاژەڵێكی سـواری هـەبووە، سـەرەڕای ئـەوەی(گـلّ)..یـاخود(داروباریـان) پێدەگواسـتەوە، هەركەسـێك لەوزەمانـە جوتێـك هێـستری هەبوایە، ئەوا بە پیاوێكی دەوڵەمەند دەژمێردرا، بازرگانەكان بەتایبـەتی ئەوانـەی قـەتارو كاروانیـان ڕەوانـەی تـەق تـەقو دەشـتی هـەولێرو پـشدەر دەكـرد، هـەردەم ژمارەیـەك وڵاغـی باریـان هـەبوو، چـونكە بازرگـانی لـەو زەمانـەدا تـەنها بـەوڵاغ ئەنجام دەدرا.

ڕێگەی ژیان:

گومـانی تێـدا نیـە دروسـتكردنی ڕێگـەی كۆیـە – بێـستانە تاڕادەیەكی باش شاری كۆیەی بوژاندەوە لـەو ڕۆژگارەدا كۆیـە شارۆژكەیەكی هـەژارو كـەم دەرامـەت بـوو، لـەماوەی ئـەو پێـنج ساڵەی ئیشكردن لـەو پرۆژەیـەدا، گـوزەرانی سـەدان خێـزان بوژایــەوە..لەمــەودای دوریــشدا چــالاكیو جموجــۆڵێكی بازرگانیو كشتوكاڵی شارەكەی گرتەوە، پێدەچێت هاوڵاتیانی كۆیە بایەخو پێویستی ئـەم ڕێگەیـەان لـە بەرچاو بووبێ، بۆیـە چـەندین داواكاریـان پێـشكەش كـرد، تـا ڕێزامەنـدی لـە سـەر

وەرگیرا، بەتایبەتی ئەوکاتەی خولێخۆشبوو مامۆستا(مسعود محمد) کە ئەو وەختە نوێنەری کۆیە بوو لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، ئەو پێشنیازەی خستە بەردەم (نوری سەعید)ی سەرەك وەزیرانی ئەوسای عێراق، ئەویش پێشنیازەکەی پەسەندکردو وەزیری ئیشغال و ئیسکانی بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەکە ڕاسپارد.. پرۆژەکە لەساڵی(١٩٥٣) دەستیپێکردو لە ساڵی(١٩٥٧) کۆتای پێهات، بەدرێژای ئەو پێنج ساڵە جگە لەوەرزی زستان، کەئەوەدەم زستان زۆر سارد بوو بەهۆی بەفرو بەستەڵەکەوە بواری ئیشکردن نەدەما وەکی تر بێ پسانەوە ڕۆژانە نزیکەی (٦٠٠) شەش سەد کرێکارو وەستا کاریان لە سەر کردووە.. بەشی هەرە زۆری کرێکارەکان دانیشتوی کۆیە بوون، ئەوانەی دیکە خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری کۆیە بوون، تەنانەت ژمارەیك لەو کرێکارانە لە دەشتی هەولێرەوە هاتبوون.. وێستگەی سەرەتای پرۆژەکە لە گەراجی کۆنەوە دەستی پێکرد.. کە ئەودەم قەسابخانە بوو، لە سێ ڕیانی بێستانە –دوکان – پشدەر تەواو بوو.. ئەوسا (هادی چاوەشلی) قائیمقامی کۆیە بوو، مرۆڤێکی فرە رۆشنبیرو خزمەتگوزار بوو، ڕۆڵی بەرچاوی لە تەواوکردنی پرۆژەکەدا بینی ،بەشی هەرە زۆری ئەو ڕێگا دوورو دژوارە بە هێزی بازوو عارەقەی کرێکاران جێبەجێ کراوە،

بەبەکارهێنانی بێڵو دوودەو تۆخماخ و عەرەبانەی دەستیەوە.. کرێی ڕۆژانەی هەر کرێکارێك تەنها(٥) درهەم بوو، کە ئەو بڕە پارەیە لەو سەردەمەدا ئەرزشی زۆر بوو، ئەوانەی کاری قورسیان ئەنجام دەدا، ڕۆژانەیان(٧) حەوت درهەم بوو، دوای دەست لە کارهەڵگرتن کرێکارانی کۆیە دەگەرانەوە ناومالْو حالْی خۆیان و ئەوانەی لە گوندەکانەوە هاتبوون، لە شوێنی کارەکە دەمانەوە. مەسرەفی خواردن و هاتووچۆ لەسەر خۆیان بوو، خواردنەکەشیان لە نان و تەماتەو پیاز پێکهاتبوو، ڕۆژانەلە(٣٠٠) جێگا کرێکارکاریان دەکرد.. جگەلە کرێکاران چەند دەستەیەکی تر هەبوون:-

١-موراقیبەکان (چاودێرەکان): فەتاح برین پێچ، سالْحی کەریمە گۆج، ڕەشیدە فەندی، حەمە عەلی مەلاسالْح.

٢-شوفێرەکان: مستفای محمەد مەروان، عەلی بەگ، تاهیری حاجی بەگ، عوسمانی مام عەولاْ، سمکۆی مام برایم.

٣- سەقاکان قادرئاغای دوکاندار(ئێستا لەژیاندا ماوە)، ڕۆژانە بەسیّ گوێدرێژ بەردەوام ئاوی لە چنارۆکەوە دەهێنایە سەر شوێنی کارکردن لەگەلْ عەبدە ئاغای باوکی شێردل حەوێزی، زاهیر مام تایەر، مستەفا ئەحمەد.

## چەند ڕوداوێکی ڕۆژانە

- حەمەی سابیر کە زۆربەمان ناوەکەیمان لەلا نامۆ نیە ، ئەو یەکێك بوو لەپیاوانی ڕژێمی ئەوسا لە کەمینی پێشمەرگەکان کوژرا، ناوبراو یەکێك بوو لە چاودێرەکان، بەهۆی هەڵسوکەوتی نالەبارو قسەی ناشیرینەوە لەگەڵ تاقمێك کرێکار ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە، کرێکارەکان دارکاری دەکەن‌و تێروپڕی لێدەدەن .
- ڕۆژێك لە گەرمەی کارکردندا (عوسمانی مام عەولاّ) بە سەیارەی پڕلەکرێکارەوە بەرەو ژوور هەڵدەکشێ، کرێکارانی سەرەوە ئاگایان لەوەنیە سەیارەیەك لە خوارەوە بەرەو سەرەوە دێت لەو ئان‌و ساتەدا بەردێکی گەورە غلۆر دەکەنەوە بەردەکە ڕاستەو ڕاست دەکەوێتە سەر بۆنیتی سەیارەکەو پانی دەکاتەوە ، بەلاّم خۆشبەختانە کەس زیانی پێ ناگات.
- عەبدوڵلاّ ڕەشید.
- فەتاحی برین پێچ.
- قادر ئاغا.

# هەڵوەستەیەك لەگەڵ ڕۆژنامەگەری كوردی

لەم سەردەمەدا بۆ هەموو كەسێك ئاشكرا بووە، كە ڕۆژنامە(دەسەڵاتی چوارەم) نەخشێكی مەزن دەگێڕێ لە بەرەو پێش بردن و گەشەپێدانی شارستانیەت و هۆشیاكردنەوەی مرۆڤ، چونكە ڕاستەوخۆ دەربڕی هەست و خواستەكانی گەلەو بە درێژایی ڕۆژگاریش ڕۆڵی كاریگەری هەبووە، لە ئاراستەكردن و هۆشیاركردنەوەی مرۆڤ و ڕونكردنەوەی ڕێبازی ژیانی خەڵك بەرەو ئایندەیەكی ڕووناك.. ڕۆژنامەگەریش سەبارەت بەو ئەرك و فەرمانە گرنگانەی لە مەیدانە جۆراو جۆراو جۆرەكانی چالاكی كۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوریدا دەیگێڕێت هەمیشە جێی بایەخ و ئاوردانەوەی ڕژێمە سیاسی و حزبیەكان بووە.. بزوتنەوەی ڕۆژنامەگەری كوردی لەو ڕۆژەوەی حەزرەتی(میقداد مەتحەت بەدرخان ) بناغەكەی دانا، تاكو ئەمڕۆ بە پێی تواناو دەرفەت و دەسەڵاتی خۆی خزمەتی بەرچاوی گەیاندۆتە بزوتنەوەی ئازادیخوازی گەلەمەمان، تەكانیشی بە كاروانی پێشكەوتن و هۆشیاركردنەوەی كۆمەڵایەتی خەڵكی كوردستان داوە.. پێش ڕاپەڕین ڕۆژنامەگەری كوردی سەرەڕای ئەو ئاستەنگ و گرفتانەی

کەڕووبەڕووی دەبۆتەوە لەگەڵ دامودەزگاکانی ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان لەململانێی توندی بەردەوام دابوو لەسەر دوو ئاستدا:-

یەکەم: گەیاندن و جێ بەجێ کردنی پەیامە نەتەوەیی و نیشتمانیەکەی و بەرجەستەکردنی ئامانجەکانی گەل، بەرەو ئایندەیەکی گەش.

دووەم: هێنانەکایەی ئاستێکی بەرز لە کاری ڕۆژنامەگەری بە پێشخستنی لە بوارەکانی تەکنیك و چاپەمەنیدا، لەبەر ئەوەی ڕۆژنامەگەری کوردی لە خەباتی بێوچان دابوو لەگەڵ داگیرکەران و بەکرێگیراوانی کوردستان. هەر لەسەرەتاوە ڕووبەڕووی داپڵۆسین و دەست بەسەرگرتن بۆتەوە، تاکو ئەمڕۆ دەیان ڕۆژنامەی حیزبی و غەیرە حیزبی دەرچوون. کەڕۆڵی گەورەیان لە خەباتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری خەڵکی کوردستان بینیوە. ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان بەپێی بەرژەوەندیە سیاسی و چینایەتیەکانیان، هەمیشە بەرەنگاری ئەو ڕۆژنامانە بوونەتەوە، کە هەڵوێستی نیشتمانی و نەتەوەییان هەبووە لەمەڕ کێشەی ڕەوای گەلەکەمان، نکوڵی لەوە ناکرێت کەرۆژنامەگەری حیزبی ڕەنگدانەوەی ڕێبازو بیری ئەوحیزبانە بوو کە خاوەنی ڕۆژنامەکەبوون بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین روخسارو

سیمادیارەکانی رۆژنامەگەری حیزبی بەم شێوەیە بخەینە ڕوو:-

١-ئەو رۆژنامانە بەشێکی گەورەی ئەرکی خەباتی نیشتمانیان بەرکەوتووە، بەحوکمی ئەوەی لە چاوی سانسۆری دەسەڵاتداران دوور بوون.

٢- هەروەکو چۆن ئەو ڕۆژنامانە سەرچاوەی سەرەکی مێژووی بزافی سیاسی بوون، بەهەمان شێوە تۆمارێکی ڕاست و دروستی قۆناغەکانی ڕووداوە جۆراو جۆرەکانی کوردستانیش بوون.

٣- ڕۆژنامەگەری کوردی ڕۆڵی سەرەکی لە هۆشیارکردنەوەو قوڵکردنەوەی بیر نەتەوەی و چینایەتی لە ناو جەماوەری گەلەکەماندا بینیوە.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو خاڵانەی سەرەوە دەتوانین بڵێین، ڕۆژنامەگەری حیزبی سەردەمی خەباتی نهێنی لاپەرەیەکی پرشنگدار بوو، لە مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی

# مەسیحیەكانی كۆیە

## مێژوویەك لە پێكەوە ژیان و قوربانیدان

ئاینی مەسیحی وەكو هەر ئاینێكی ئاسمانیتر بۆ ئاشتی و خێرو خۆشی مرۆڤایەتی هاتۆتە كایەوە. حەزرەتی مەسیح لەجیاتی مەنتقیی تۆڵەو رق وڕقین، بیری لێبوردەیی و تەبایی لەسەر زەوی بڵاوكردەوە.. خاكی فەڵەستین شوێنی پەیدابوون و بڵاوبوونەوەی زۆربەی ئاینەكانی، بەو پێیەی كوردستانیش لە ڕووی جوگرافیەوە لەو وڵاتەوە نزیكە، بۆیە زوویا خود درەنگ تیشكی ئەو ئاینە گەیشتۆتە كوردستان.

## گەیشتنی ئاینی مەسیحی بۆ هەرمۆتەو كۆیە

بەپێی دەستنووسی(مەشیخا زیخا) كە لە ناوەڕاستی سەدەی شەشەم بڵاوكراوەتەوە، ئاینی مەسیحی بۆ یەكەم جار لە كوردستان لە ناوچەی(حدیاب) هەولێر بڵاوبۆتەوە.. هەر لەبارەی بڵاوبونەوەی مەسیحیەتەوە لە كوردستان، مامۆستا(حنا ئەنتوان) دەڵێ: ئاشكرایە مەسیحیەت لە ئۆرشەلیمەوە بەرەو شاری ئەنتاكیە، لە ئەنتاكیەش گەیشتۆتە

ئۆرفە، ئینجا دیار بەکرو پاشان گەیشتۆتە ناوچەی حدیاب‌و گەرمیان.

لە ساڵی (٢٥)ی زاینی((ماری)) کە پاتریارکی کەنیسەی ڕۆژهەڵات بوو، لەگەڵ چەند دەست‌و پەیوەندێکی خۆیدا، پەیامی مەسیحیان گەیاندە هەرمۆتە هەر سەبارەت بە بڵاوبونەوەی مەسیحیەت لە کۆیەو هەرمۆتە بیرو بۆچونێکی تر هەیە، کە دەڵێن (ژمارەیەك لە خەڵکی زەردەشتی ڕوویان لە((بیت لحم))کرد، کە زێدی حەزرەتی عیسایە لە فەلەستین،لەویٚ بەدیداری حەزرەتی مەسیح شادبوون‌و بڕوایان پێهێنا، ئیتر لەو ڕۆژەوە بۆ زیاتر تێگەیشتن لەم ئاینە نویٚ یە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ناوچەکانی عیلام و مادو جزیرە چوونەتەئۆرشەلیم. بە پێی ئەو ئاسەوارو کەلاوەو گۆرستانانەی لە نێوان تۆبزاواو هەرمۆتە هەن، ئەوە دەردەخەن کەهەرمۆتە لە سەردەمی زوو شار بووە.. دەربارەی بڵاوبونەوەی ئاینی مەسیحی لە کۆیەدا هەندێك کەس لەو بڕوایە دان، کە بۆ(٢٠٠) تا(٣٠٠) ساڵ لەمەوبەر دەگەرێتەوە، واتە لە سەردەمی حوکمڕانی میرەکانی ڕەواندز، چونکە لەو ڕۆژگارەدا زۆربەی خێزانە مەسیحیەکانی ناوچەی (ڕواندزو هیران و نازەنین و خۆران) لە ترسی زەبرو زەنگی (پاشا کۆرە) ئەو شوێنانەیان بە جێهێشت و هاتنە کۆیەو هەرگۆتە.

## کاتێك مێژوو دەدوێ

بە درێژایی ئەو سالآنە دیانەکان بە ئاشتی و تەبایی لەسەر ئەم خاکە ژیاون، پارێزگاریان لە داب و نەریت و کەلتوری خۆیان کردووە، بەلآم لە سەرەتای فتوحاتی ئیسلام و هەندێ جومگەی مێژوویی دیکە ڕووبەڕووی ئازارو دەربەدەری بوونەتەوە، کاتێك هێزەکانی ئیسلام بەرەو هەرمۆتە پێشڕەوی دەکەن، کە لەو سەردەمەدا مەڵبەندێکی گەورەی دیانەکان بوو، واتا شەڕ لەدەرگای هەرمۆتە دەدا.. بەهۆی ئەوەی دیانەکان پێداگری لەسەر ئاینی خۆیان دەکەن شەڕێکی قورس لە نێوان هەردوولا هەڵدەگیرسێ و لە ئەنجامدا جەستەی سێ هەزار مرۆڤ لەم ناوە دا دەکەوێ و حەوت سەد کەسیش وەکو دیل دەکەونە بەردەست سوپای داگیرکەر، پاشان هەرهەموویان تیرباران دەکرێن..! لێرەدا پارچە شیعرێکی (مەلا ڕەئوف حەوێزی) دەخەینەڕوو، کە تیایدا وەسفی شەڕی (هەرمۆتە) دەگێڕێتەوە:-

لەولاش کوردەکان زۆر بە تەدارەك

هاتنە ڕووبەڕووی یارانی دڵپاك

سەحابان دەستیان کرد بە هەڵمەت بردن

لەملاو لەولا بوو بەتالآن کردن

لەناو ئەو دێ یە دەنگ بەرز بۆوە

عالەمێکی زۆر خێرا کۆبۆوە

پاش شەڕێکی زۆر تیپی ئەرمەنیان

زۆریان شەهید کرد لە سوپای ئەسحابان

تالآنەکەیان هەموو ستاندەوە

لەولاش عەبدوڵڵاّ بەتاك مایەوە

دوای جوهدێکی زۆر مەردی ئیخلاس

جا شەهیدیان کرد کوردی خوانەناس... هەتا کۆتای شیعرەکە

پەیرەوکردنی سیاسی ڕەگەزپەرستی ئاینی و سەرهەڵدانی کێشە سیاسیەکانی نێوان فارس و تورك و عەرەب و کورتبینی سیاسەتی(پاشا کۆرە)، کە هەر بە تەنها مەسیحیەکانی نەکردە ئاردی ناو دڕك، بەڵکو زۆر بەتوندی پەلاماری میرنشینی(داسنی ئێزیدی) داو لە ماوەیەکی کورتدا لە ڕەگ و ڕیشە هەڵیکێشان.

## مەسیحیە کوردەکانی کۆیەو هەرمۆتە

ئاینی مەسیحی بە گرتنەبەری ڕێگەی ئاشتی و قەناعەت پێهێناوە، لەناو گەل و ناوچەی جیا جیا بڵاوبۆتەوە، وەکو ساسانیەکان و میدیەکان و عیلامیەکان و عەرەبەکان و هتد... بۆیە دەبینین هەروەکو چۆن عەرەبی مەسیحی و ئەڵمانی مەسیحی و فەرەنسی مەسیحی بەرازیلی هەیە، بەهەمان شێوە کوردی مەسیحیش هەیە، کوردە مەسیحیەکان خەڵکی ڕەسەنی ئەم نیشتمانەن، ئەوان لە وڵاتێکی دیکەوە نەهاتوون، بەڵکو رۆڵەی ئەم خاکەن.

زانای بەناوبانگ(محەمەد ئەمین زەکی بەگ)پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ، کەمەسیحی و جولەکەکانی کوردستان بە نەژاد کوردن، هەروەها (پ.لیرخ) بەپشت بەستن بە ماتریالی ئەنسرۆپۆلۆجی، مەسیحیەکانی کوردستان بەکورد دادەنێ بەلاّم پەیرەوکردنی سیاسەتی جیاوازی ئاینی و شۆڤێنی، کوشت و کوشتارو دەربەدەری لێکەوتەوە، ئەو سیاسەتە مەسیحیەکانی دوچاری گۆشەگیری و دووره پەرێزی کرد، کە لە ئەنجامدا هەستی ئاینی ئەوانی بەرامبەر هەستی نەتەوەیی بە هێزتر کرد، لە کەش و هەوای ئاشتی و لێبوردەی، هەر لە

کۆنــەوە ڕۆڵــەکانی ئــەم شــارە بــە تــەبایی و دوور لــە گیــانی ڕەگەزپەرستی و توندڕەوی ئاینی پێکەوە ژیان بەسەر دەبەن.
مەســـــیحیەکانی کۆیــــەو هەرمۆتــــە هەمیــــشە خــــەڵکی نیــشتمانپەروەرو بــــە ئەمــــەك بوون،لــــە ســــەرژمێریەکانی ساڵی(١٩٨٧) دا ڕژێمــی بــەعس دەیویــست هــەموو دیانــەکان بــە(قومیــە عربیــە) نــاونووس بکــات، بــەڵام ئــەوان نەچــونە ژێــر فــــشارو زۆری بەعــسیەکان، بۆیــــە بەشــــێکیان بــــەکورد، بەشێکیشیان بە کلدلن لە قەڵەمدا.. لەناو دیانەکانی کۆیەو هەرمۆتــە، چــەند خێزانێکــی ناســراو دەرکــەوتوون، وەکــو بنەماڵەی(خواجە ئەبڕەهاو خواجە مەڕبێن قەشەو بنەماڵەی خواجە فەڕەنسی و مام بوتریس و سەلمانە سوورو بنەماڵەی قەشـان و شمـونی پـەری و خواجـە یەڵـدەی بـاوکی سـێوەی هونەرمەندی مەزن)، دیانەکان ژمارەیەك بۆنەو جەژنی تایبەت بەخۆیان هەیە، کە لەم سەردەمەی دەسەڵاتی کوردیدا بەو پەڕی ئازادی مومارەسەی دەکەن، لەوانە:-

١-جەژنی لەدایك بوونی حەزرەتی مەسیح.

٢-جەژنی قیامەی حەزرەتی مەسیح.

٣-جەژنی سەڵیب، کە بە جەژنی شەڕە ئاو ناسراوە.

٤-جەژنی دۆزینەوەی ئەو سەڵیبەی حەزرەتی مەسیحی پێ لە خاچدرا.

**پلەو پایە ئاینیەکان لە کەنیسەی ڕۆژهەڵات بەم شێوەیەی خوارەوەیە:-**

**قارویا - هوەیدیە قینە - شەمالشە.**

**قاشە - کور ئەدیسۆنە - ئەرکەن دیەعقون.**

**ئەپسوقیا - مەتروپولیتا - پاتریکا.**

**ئەمانەی خوارەوە ناوی ژمارەیەك لە قەشە ناسراوەکانی کۆیەن:-**

**١- قەشە گورگیس.**

**٢- قەشە مەتی.**

**٣- قەشە سلێمانە شیغۆ.**

**٤- قەشە ئیلیا.**

**٥- قەشە پۆلیس عەبدۆکە.**

**٦- قەشە وەحید.**

## مەلا ئەسعەد بولبولی باڵشکاو

دەستپێك:

لە گەڵ پیەدابونیەوە تا ئەمڕۆ گەلی کورد خاوەنی هونەری گۆرانی و ئاوازی خۆی بووە، ئەم هونەرەش بەپێی ڕۆژگارو قۆناغ، زۆربەی جاران لە بازنەی سەرخانی ژیانی ئابووری دەستەو چینە سەردەستەکانی کۆمەڵگە سوڕاوەتەوە، ئاوازو گۆرانی لە کۆیە ڕەنگدانەوەی ژیانی کۆمەڵگەو دەنگدانەوەی ئاوازو سروشتی نێوجەرگەی خاکە داگیرکراوەکەی کوردستان بووەوبەشێکی بنەڕەتی خوو ڕەوشتی ڕەسەنی کوردی لەم شارەپێکهێناوە.. هەر کەسێکیش بە جوانی و بەوردی لە هونەری مەقامبێژو هونەرمەندانی کۆیەی کۆڵیبێتەوە، هەنگێنێ بۆی دەرکەوتووە چۆن ئەو هونەرمەندانە چوونەتە قوڵایی خەم و خۆشیەکانی کۆمەڵی کوردەواری و هەر لە کۆنەوەش ئەو هونەرەیان بە سەلیقەو زەوقی خەڵك گوتووە.. کە سەرەنجەکانیشلنمان قوڵترو نیگاکانمان وردتر دەکەینەوە، دەگەینە ئەنجامێك کە هەڵکەوتە جوگرافیەکەی و شوێنە دڵگیرو ڕازاوەکەی لەلایەك، لەلایەکی ترەوە سەختی هاتوچۆی نێوان کۆیەو دەوروبەرەکەی بەهۆی نەبوونی جادەی هاوچەرخ بەتایەتی لە وەرزی زستاندا.. وایان کردووە، کە هونەری

مەقام و گۆرانی ئەم ناوچەیە لەم سنورە خول بداتەوە، واتە هونەرێکی ناوچەییەو خاوەن تایبەتمەندی خۆیەتی و جیاوازە لەگەڵ تام و بۆی هونەری بەشەکانی کوردستان.. وەکو لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا، هونەری گۆرانی و مەقامات لە ڕۆژگارێکی زووەوە لەم شارە بەدەرکەوتووە، بەڵگەشمان بۆ ئەم قسانە پەرتوکەکەی(خدر کوری عمر کویسنجەقلی) یە بەناوی (الازکار للامام النواوی)کە لە ساڵی ١٣٧٤زاینی، هەموومان دەزانین موزیك لە ژینگەیەکدا سەرهەڵدەدا، کە لەڕووی شارستانیەتەوە هەنگاوی باشی نابێ.. کۆیەش عەیامێکە گەشەکردنێکی باشی بە خۆیەوە بینیوە، لە ڕووی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریەوە، واتە ئەم ژینگە لەبارە بووە کە هونەر تێیدا نەشونمای کردووە..! بە تایبەتی لە ڕۆژگاری(ئەمین ئاغای ئەختەر) کە مرۆڤێکی شاعیرو هونەرمەندو کەسایەتیەکی هەڵکەوتووی کۆیە بوو. ئاوازی بۆ شیعرەکانی خۆی و کەسانی دیکەش داناوە.

## ڕۆژگاری گەنجایەتی

مەلا ئەسعەد لە هەرەتی گەنجایەتیدا بەهرەی هونەری لێدەرکەوتووە، بەتایبەتی لە مەقامەکانی پێنج گاو چوار گاو خورشیدیو حیجازو سەباو بەیات و نەواو حەکیمی، بەو هۆیەوە زۆربەی گەنجانی ئەو سەردەمەی کۆیە لاسایی ئەویان دەکردەوەو کەوتنە ژێر کاریگەری ئەوەوە بەتایبەتی هونەرمەندان:-

تایەر تۆفیقو حمدامین عباسو وەستا باقی حەلاقو مەلا ئەحمەدەکۆرە.. بە شێوەیەکی دی دەتوانین بڵێین ئەو هونەرمەندانە لە قوتابخانە هونەریەکەی مەلا ئەسعەد پێگەیشتوون، شایانی نوسینە مەلا ئەسعەد لە سەرەتاوە سترانی ئاینیو تەواشیحو مەولودی پێغەمبەری خوێندۆتەوەو لە بۆنە ئاینیەکاندا لە گەڵ مەلاو فەقێکان، ئەگەر چی مەلائەسعەد لە خوێندنی ئاینیدا پلەیەکی بەرزی بەدەست نەهێناوە، بەڵام لە بەرخاتری مەلاقادری سابلاغی باوکی، ناوی مەلایان بەسەردا سەپاند، مەلائەسعەد سوودی لە مەقامەکۆنەکان وەرگرتووە، لە ڕۆژانی هەرزەکاری لە کۆڕی مەولود خوێندندا فێریان ببوو، هەروەها لە کاتی لاوێتیدا

لەگەڵ هاوڕێکانی وەك، سمایلە خڕەو ڕەفیقە چارچاو حمدامین کەبابچی و حمدامین عباس لە نێو باغەکانی حەماموك وئاشان و ئۆمەر خوچان و تاتوکان و تەمتەمان کە لە بەهاران و هاوینان دەبوونە سەیرانگەو ڕۆژیان لێ بەسەر دەبرد. لە و سەردەمەدا لە کۆیە دوو ڕێچکەی مەقام گوتن هەبوو:-

ڕێچکەی یەکەم: فۆلکلۆری بوو، شۆرە سوارانی ئەم ڕەوتە( حەنیل و سێوە) بوون، کە میراتگری ئاوازو مەقامەکانی ئەمین ئاغای ئەختەر بوون.

ڕێچکەی دووەم: کلاسیکی بوو، کە ئاوازو شیعرە کلاسیکیەکانی شاعیرانی کوردو فارس سەرچاوەی سەرەکی ئەو هونەر مەندانە بوون، بەتایبەتی (مەلا ئەسعەد). مەلا ئەسعەدسالی ١٩٥٥بەمەبەستی تۆمار کردنی چەند مەقامێك ڕوو دەکاتە بەغدا، بەڵام مەخابن لەم هەوڵەیدا سەرکەوتوو نەبوو، بەهۆی ئەوەی گوایە نەیتوانیوە لەگەڵ تیپی موزیکی نێزگە خۆی بگونجێنێت.. بۆیە لەوێ دەڵێن بچۆ مەشق لەگەڵ تیپی موزیك بکە، لەوەوە دڵی دەڕەنجێ، جارێکیتر ناچێتەوە بەغدا. دەردی ئەوین لە ژیانی مەلا ئەسعەدی هونەرمەندا، چەندین ڕووداوی سەیرو تراژیدی بەخۆیەوە بینیوە، لێرەدا یەکێك لەو ڕووداوە ناخۆشانە دەخەینە بەردیدی خوێنەرانەوە، ئەم ڕوداوە دواتر سەراپا ژیانی ئەو هونەرمەندە دڵ ناسك و

دەنگ خۆشەی بە خەم و ڕەشبینی ڕەنگ ڕێژ کردووە، پاشان لە ڕێگەی دەنگە ئەفسوناویەکەیەوە بە مرواری ئەو شیعرە کلاسیکیە جوانانەو بە پلەیەکی بەرزی کەم هاوتا، بە بەستەو مەقامو ئەدای کردون.. مەلا ئەسعەد لە تەمەنی گەنجێتیدا گیرۆدەی ئەوینی کچە تورکمانێکی کەرکوکی دەبێت بەناوی (ئامینە) باوکی ئامینە کە(نەجم)ی ناوبوو، لە کۆیە پۆلیس بووەو کرێگرتەی خانوەکەی مەلا ئەسعەد بوون، وەکو باسکراوە ئامینە کیژێکی جوان و دڵڕفێن بووە ڕۆژگار دێت و دەچێت، جوانی ئەو کچە دڵی مەلا ئەسعەدی کەمەندکێش کردووە، ئیدی مەلا لەو ئیشقەدا شێتو شەیدا دەبێت.

مەلا ئەسعەدی دەنگ خۆشی لاوچاك، هەرچی شیعری تەڕو ناسك هەیە بە ئاوازی جوانو بەرز دەیکردە دیاری بۆ باڵای ئامینە خان.. مەلا ئەسعەد خزمو کەسی ڕادەسپێریٚ تا بچن داخوازی ئامینە بکەن، بەڵام بەداخەوە ئوبتاشی(نەجم) دەست بەڕوویانەوە دەنێت، بەو بیانوەی کچی خۆی نادت بە چاوەش، بەڵام خۆش بەختانە دایکی کچەکە لایەنگری مەلا ئەسعەدو ئامینە دەبێت.. بۆیە لە ئەنجامدا باوکیشی ڕازی دەبیٚو مارەیان دەبڕن و دەیگوازنەوە، ئیتر باوکی کچە کۆیە بەجیٚ دەهێڵیٚ، بەڵام ئەستێرەی بەختی ئەو ئەوینە زۆر درەوشاوە نەبوو. ئەوەبوو ئامینە خان بەسەر منداڵەوە کۆچی

دوای کرد.. مردنی ئامینه مەلا ئەسعەدی خستە ناو گێژاوی خەمێکی سەختو بێ پایانەوە، ئەوینو سۆزی ئامینە هەمیشە ئاوێنەو ئاوێزانی هونەری مەلا بوون، مەقامو بەستەکلنی مەلا لە مەودوا بۆنی غەریبیو تەنیاییو سۆزی خۆشەویستیەکی ناکامی لێدەهات، یادی رۆژانی خۆشیی و وەکو خەوێکی کورت خایەن، زوو هاتو زوو چوو، یادی ئەو ڕۆژانەی بە هەنسكو فرمێسك باران دەکردەوە، هەمیشە شیعرەکەی(ئەخۆل) ی شاعیری بە ئاوازێکی غەمگینو مەقامی هیجران دەگوت:

شەرتە تاڕۆژی حەشر،خولیای من بی چاوی یار
وێڵی سەحرابم هەمیشە تەرك بکەم خۆشیو دیار
شەرتە وەك مەجنونی بێکەس، دەشت وکێو بێ مەسکەنم
تا بەداخی لەیلەوە دەمنێنە قەبری تەنگو تار

یاخود شیعرەکەی وەفایی دەگوت، کە بۆن کڕوزی لە دڵ و دەروون هەڵدەستاند:

لە باخان ئاهو ناڵێن دێ دەڵێن شای نێو گولان ڕۆی
لە مەیخانان سەدان شین دێ دەڵێن پیری موغان ڕۆیی

لە دوای مردنی ئامینە، مەلا تا دەمرێت لە غوربەتا بە تەنهایی دەمێنێتەوە چاوی بەو شوێنە هەڵنایێ، کە ئازیزەکەی تێدا نێژراوە..! سەری خۆی هەڵدەگرێو ڕوودەکاتە کوردستانی ئێران، لە وێش ئۆقرە ناگرێو دەگەڕێتەوە سلێمانی و لەوێ ژن دێنێ، پاشان دەگەڕێتەوە کۆیە. مەلا ئەسعەدی نەمر دەیان بەستەی خۆش و مەقامی ڕەسەنی هەیە، کە بەبەشێکی بەرزی هونەری کوردی ئەژمار دەکرێت، لە ئاخرو ئۆخری تەمەنیدا، یادگارە تاڵەکان نوشتاندیانەوەو چیتر خۆی لە بەر لێشاوی خەمو ناخۆشی نەگرت، ئەوەبو لە بەهاری ساڵی ١٩٥٨ کۆچی دوایی کردو لە ڕێوڕەسمێکی شایستەدا لە ئارامگەی سەید جامی بە خاك سپێردرا.

## کونی کرۆژ

### ئەفسانەو سەرچاوەی ژیان

کاتیێك لە کۆیەوە بەسەر سنگی چیای باواجی سەرکەش هەڵدەگەڕێ و دەگەیتە ترۆپکی چیاکەو دەڕوانیتە ئەودیو لوتکەی بەرزو دۆڵی ڕەنگینو هۆبەو هەواری شوانکارەو جوانیو هێمنی ئەو گوندانەی لە ئامێزی ئەو دۆڵانەدا خەوتون سەرەنجت کەمەندکێش دەکرێ لەبەردەم گەورەوی و خۆراگری ئاوەگردو سەفینو بەنەباوی، کە ڕۆژگارێك مەتەرێزی پیاوە

گەورەکان بوون، سەرسام دەبی و شریتی ڕۆژە سەختەکانی پێشمەرگایەتی بەبیر دێتەوە.. ئینجا هێدی هێدی لەگەڵ نشێوو پێچەکانی ڕێگاکە شۆڕدەبیەوە ناو باوەشی تابلۆ قەشەنگەکانی سروشت و ڕەشماڵی مەردارەکانی بۆلی و مەنتك و بلباسان.

## کونی کرۆژ

ئەم ئەشکەوتە یاخود ئەم کونی کرۆژە، کە لەناو خەڵکی کۆیەو ناوچەکە واناسراوە، دەکەوێتە پێشەوەی زنجیرە چیای بەنەباویٚ، هەزارو حەوت سەد مەتر لە رۆژئاوای گوندی کرۆژەوە دوورە، کونەکە لەوێنەی دۆڵێکە درێژەیەکەی کیلۆمەترێك زیاترە.. زارکی کونەکە دوومەتر بەرزەو پانیەکەشی شەش مەتر دەبێت، دوای ئەوەی پێنج مەترێك دەچێتە ناو کونەکە، ئینجا کونەکە دەبێتە دوو بەشەوە، یەکێکیان تەپو شێدارە، ئەوی تریان ووشکە، بەهۆی تاریکیەوە دەبێت چرا لەگەڵ خۆت هەڵبگری، ئەو کونەیان کە وشکە لەڕاستیدا ئەشکەوتێکە بۆخۆی چونکە درێژیەکەی بیست مەترو پانیشی پانزە مەتر دەبێت، دوای ئەوەی چەند هەنگاوێك دەچیتە پێش پانتاییەك کە دوو سەد مەتر چوارگۆشە دەبێت، لێرە بەدواوە چەند کونێکی بچووکی

لێدەبێتەوە گەر بەو کونەی دەستە ڕاستەوە بڕۆی دەبێت بە سنگە خشکێ بڕۆی، ئینجا دەگەیتە شوێنێکی فراوان ، کە چیتر بواری چوونە پێشەوەت بۆ نامێنێ، چونکە دۆڵ و گەلی دێتە بەردەمت.. هەرچی کونەکەی تریشە شێدارو تەڕە دوای پەنجا مەتر ڕۆیشتن تەسک دەبێتەوە و هەمدیسان فراوان دەبێتەوە، ئینجا دەبێتە کونێکی بچووك. لێرە بە ئاشکرا گوێی بیستی  خوڕەی ئاو دەبیت پێدەچێت دەنگی ئەو ئاوەبێت، کە لە ژێرەوە دەڕوات، پاشان لە بەردەمی کونەکەدا بە قەڵبەزو هاشە هاشەوە دێتە دەرەوە.

## ئاوی زۆرو بە  پیت و شوێنی گەشت و گوزار

بێگومان ئەو شوێنەی ئێمە لێی دەدوێن گەر بایەخی پێبدرێت، ئەوا دەبێتە ناوچەیەکی گەشتیاری جوان.سەرەڕای ئەوە گەر تۆڕی ڕێگاوبان بۆ سەر ئەو ئاوە کانزاییە دروست بکرێت ئە وا ژمارەیەکی زۆری گەشتیار دێتە ئەو شوێنە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی پێست.. لە سەروی کونی کرۆژەوە ئاوێکی سازگارو سارد بەو دۆڵە دێتە خوارەوە، کاتێکیش لەگەڵ ئاوەکەی کرۆژ ئاوێزانی یەکتر دەبن، لە هاژەو خوڕەی دارو ئاوەکەدا سیمفۆنیایەکی سروشتی لێ بەرز دەبێتەوە، کە هەموو دار هەنارو سێوەکانی گوندی کرۆژ

دێنێته سەماوە..! ساڵە های ساڵە ئەم ئاوە بەناخی ئەو خاکە بەپیت و فەڕا ڕۆدەچیٚ ژیانو خۆشەویستو جوانی بەرهەم دێنێت.. دەڵێن لە لوتکەی بەنەباوێوە جارێك یەکێك لە شوانەکان شمشاڵەکەی لێدەکەوێتە ناو کونێکەوە، دوای چەند ساڵێك شمشاڵکەیان لەگەڵ ئاوی کرۆژ دۆزیوەتەوە، ئەم کونی کرۆژە لە ساڵە هەرە سەختەکانی ڕۆژگاری ئاوارەیی و ئەنفال شوێنی خۆحەشاردانی سەدان خێزانی ئەو ناوچەیە بووە.

تێبینی:-

بۆ نوسینی ئەم بابەتە سوودم لە زانیاریەکانی (مام احمد و کاك ئەمیر) کەدانیشتوی گوندی کرۆژن وەرگرتوە.

## ( بەر لە پێشهاتەکان چۆن بینای ناخی مرۆڤی کورد دەکەینەوە )

هەرچەندە گەلی کورد یەکێکە لەگەلە هەرە دێرینەکانی ناوچەکە، بەلاَم مێژوو دەریخستووە کە هەستی نەتەوەیی و جولاَنەوە شۆڕشگێڕیەکانی زۆر کۆن نەبێت، بزوتنەوەو شۆڕشەکانیشی کە مۆرکی نەتەوەییان لە خۆ گرتووە لە ژێرکاریگەری بزوتنەوەی گەلانی دیکەی ناوچەکەو جیهان بووە،گەر لەواقعی سیاسی و کۆمەلاَیەتی و مێژوویی گەلی کورد وورد ببینەوە دەردەکەوێت کە ئەم گەلە هەمیشە خاوەنی خاك و دانیشتوان بووەو لەگەلە ڕەسەنەکانی ناوچەکەش بووە.. بەلاَم بەهۆی کۆمەلێك هۆکاری دەرەکی و خۆیەکی تاکو ئەم ڕۆژگارەیەش نەیتوانیوە حوکمڕانی گەل و خاکەکەی خۆی بکات، هەر بۆبەدەستهێنانی دەسەلاَتی سیاسی دەیان شۆرش و ڕاپەڕینی دژی داگیرکەرانی کوردستان بەرپاکردووە.. جەنگی یەکەمی جیهانی﴿١٩١٤-١٩١٨﴾ ئالوگۆڕێکی قورسی بەسەر نەخشەی جیهان داهێنا، دەولەتی عوسمانی کە نزیکەی پێنج سەد سالْ دەسەلاَتی ڕەشی بەسەر دەیان گەلی ناو ئەو ئیمپڕاتۆریەتە پان و بەرینەدا سەپاندبوو،

له ئاكامی ئەو جەنگەداسنورەكان لێك ترازان و زۆربەی گەلانی ناو ئەو دەوڵەتە لێی ڕاپەڕین‌و ئازادیان بەدەست هێنا.. بە هۆی ئەوەی خاكی ویلایەتەكانی بەغداو بەسرا لەو سەردەمەدا مـوژدە بەخـشی دۆزینـەوەی ڕێژەیـەكی زۆری پـەترۆل لیّ چاوەڕوان دەكـراو بـەپێی بەرژەوەندیـە ئـابوری‌و سیاسـی‌و جیۆپۆلەتیكەكانی ئەوسای حكومەتی بەریتانیای مەزن كەلەو ڕۆژگـارەدا گـەورە زلهێـزی جیهـان بـوو و بـەو دەوڵەتـە ناسـراوبوو﴿كـە خـۆر لەسـەر خاكەكـەی ئاوانابێـت﴾ وە بـەپێی ڕێكەوتتنامـە نهێنیەكـەی سـایكس بیكـۆ لەتـشرینی دووەمـی ساڵی﴿١٩٢٠﴾ لەسەر خاكی نێوان دوو ڕووبارەكە بانگەشەی دامەزراندنی دەوڵەتێكی نویّ بەناوی ﴿عێراق﴾ ڕاگەیەنرا.

بۆ ئەم مەبەستە﴿عەبدولڕەحمان ئەل ڕەقیب﴾ كە بەڕەگەز كورد بوو دیاری دەكەن بۆ پێكهێنـانی یەكـەم كابینـەی وەزاری لـە﴿٢٣﴾ی ئـابی﴿١٩٢١﴾ لـە ژێـر ئینتیـدابی بـەریتانیا.. لـە بەرئـەوەی عەرەبەكان لـە جـەنگی یەكـەمی جیهانیـدا لایـەنگری ئینگلیـز بـوون لـە تێكـشكاندن‌و دەرپەڕانـدنی هێزەكـانی عوسمانی، بۆیە دوای كۆتایی هاتنی ئەو جەنگەو لە پاداشتی ئـەو هاوكـاری كردنـە یانـدا چـەندین دەوڵـەتی عـەرەبی قـووت كـردەوە بەسـەرۆكایەتی دۆسـت‌و لایـەنگرانی حكومـەتی ئینگلیز.

شا فەیسەڵی یەکەم یەکێك بوو لە بنەماڵەی﴿هاشمیەکان﴾ دوای ئەوەی سوریەکان دریان پەڕاند، هێنایان لە عێراق تاجی پاشایەتیان لە سەرنا.. بەڵام کوردستان کە لەلایەن عوسمانیەکانەوە بە ویلایەتی موصڵ ناسراو بوو لە شارەکانی هەولێر و کەرکوك و سلێمانی پێك دەهات و وەڕێژەی هەرە زۆری خەڵکەکەی ئەوسا و ئێستاش هەر لە کورد پێك دێت.. لە بەردۆزینەوەی ڕێژەیەکی زۆری پەتڕۆڵ و شوێن و ستراتیجیەتەوە، بۆیە هێزەکانی بەریتانیا دوای ئەوەی پرۆسەی گرتنی ویلایەتەکانی بەسراو بوغدایان تەواو کرد هێزەکانی بەرەو باکوور جولاند هەرچەندە ئاگربەست لە نێوان لایەنە بەشەڕهاتوەکان ڕاگەیندرا بوو.. بەڵام بەهۆی ئەوفاکتەرانەی کەپێشتر ئامارژەمان پێدا هێزەکانی بەریتانیا کوردستانی باشووریشیان داگیر کردو کۆتاییان بە ئەڵقەی زنجیرەی داگیرکردن هێنا.

لەسەر ویلایەتی موصڵ﴿کوردستان﴾ کێشەی گەورە کەوتە نێوان ئینگلیزەکان و تورکەکان هەروەها مشت و مڕێکی سەختیش لە نێوان بەرەی هاوپەیمانی هاتە کایەوە، ئەم کێشەو گرفتانە دواتر چارەسەر کران بەڵام کێشەی نێوان کوردو حکومەتی ئینگلیز لە پاشانیش حکومەتی عێراق تاکو ئەمڕۆ بێ چارەسەر ماوەتەوە لە سەرەتا ئینگلیزەکان دەرهەق

بەداخوازیەکانی گەلی کورد تا رادەیەك نەرمیان نواند.. ئەوەبو قەوارەیـــــەکی کـــــوردی لـــــە بەشـــــێکی کوردســـــتان بەسەرۆکایەتی﴿شێخ مەحمود﴾ڕاگەیەنرا..

لـە کـانوونی دووەمـی سـاڵی(١٩٢٢) بەرپرسـە بریتانیـەکان لەگــەڵ شــا فەیــسەڵ لــە(٢١)ی تــەموزی(١٩٢١) بــەیانێکیان دەرکــرد لــە بەشــێکی داهــاتووە﴿حکومــەتی خــاوەن شــکۆی بەریتانیا و حکومەتی عێراق دان بەمافی ئەوکوردانە دادەنێین کە لە چوار چێوەی سنوری عێراق دا دەژین و خوازیاریشین کە هێزە کوردیەکان هەماهـەنگی بکەن بۆ گەیشتن بەدامەزرانـدنی ئەو حکومەتـەو کایەی چالاکیەکانی و نوێنەرانیشی کەخاوەن بڕیارن دەنێرێ بۆ وتووێژکردن لە سەر ئەو مەسەلە ئابووری و سیاسـەتە لەگەڵ نوێنـەرانی هـەردوو لا (حکومـەتی بەریتانی و عێراق )..

دوا بـەدوای ئـەوە بـەخێرایی ئـەو حکومەتـە دامـەزراو شێخ مـەحمودیش بـوو بـە مـەلیکی کوردسـتان، بـەڵام ئـەوێ ڕۆژێ چــونکە کۆمەڵگــەی کــوردی نەگەیــشتبوە ئاســتی بــەرزی هۆشیاری کە هەموو تواناکانی خۆی بۆ سەرخستنی پـرۆژەی دامەزرانــدنی دەوڵــەت تــەرخان بکــاتو بــەهۆی ســەرهەڵدانی هەنـدێ کـەمو کـورتی لـە عەقلیـەتی سیاسـی سـەرکردایەتی

کـــوردو بـــاش نەخوێندنـــەوەی ئاراســـتەی ململانـــێ کـــانی ناوچەکەو جیهان ئەمانە لە لایەك.

لە لایەکی ترەوە پاشە گەز بوونـەوەی حکومـەتی بـەریتانیا لە پەیمان و بەڵێنـەکانی و چاوچنۆکی و چڵێسی بۆرجوازیـەتی عەرەبی ئەم هۆکارانە تێکڕا خـەونی هاتنـە کایـەی ئـەو دەوڵـەتە کوردیـەی بەیـەکجاری لـەگۆڕنا.. لـەو ڕۆژەیـەوە کوردسـتان بەناڕەواو دوور لـە داخـوازی ڕۆڵـەکانی گـەلی کـورد لکێنـدرا بـە دەوڵەتی تازە دامەزراوی عێراقەوە..

هەیکەلی تازە دامەزراوی ڕژێمـی عێراقـی و پێکهاتـە ئاینی و مەزهەبـەکانی هـەر لـە سـەرەتاوە گـەرای شـەڕو ئاشـوب و دووبەرەکی لە خۆگرتبوو عێراق بەو پێکهاتە مۆزایکیـەوە کەلـە باکوری دا زۆرینـەی کـورد کەتـەواو لـە سـەرجەم گـەلانی تـری عێـراق لـە ڕووی زمـان و داب و نـەریت و کـەلتوورو مێـژوو کۆمەلآیەتیەوە جیادەکرێتەوە . هەرچی ناوەڕاستەکەشیتی کە لە بەغداو دەووروبەری پێك دێت ئەوا عـەرەبی سونە مەزهـەب زۆرینەن و مۆرکێکی مەدەنی و بازرگانی یان هەیـە ئەوەتـەی ئـەم دەوڵـەتی عێراقـە دامـەزراوە هەمیـشە جلـەوی دەسـەلآتی عێـراق بەدەسـت ئـەو کەمینـە مەزهەبـەوە بـووە بـەلآم باشـورەکەی کەزۆرینـەی خـەڵکی عێـراق پێـك دەهێـنن لـەڕووی مەزهەبەوە شیعەن ئـەمان مـۆرکێکی جوتیـاری عەشیرەتگـەریان

پۆشیوە ئەمانیش وەکو کورد و مەزهەب و کەمینە نەتەوەکانی دیکەی عێراق هەردەم ڕووبەڕووی زوڵم و ستەمی مەزهەبی و چینایەتی کەمینەی سوننە مەزهەبی عەرەب بونەتەوە ئەو فرە ڕەنگیە لە ڕووی مەزهەب و ئاینەوە هەمیشە بەدرێژایی تەمەنی هەشتا ساڵەی عێراق کۆسپێکی گەورە بوو لە بەردەم هێنانە کایەی ئارامی و ئاسایش و خۆشگوزەرانی لەم وولاتەدا ، وێڕای ئەوەی داگیرکەران و زلهێزەکانی ئەوی ڕۆژێ ی جیهان بەناڕەوا نیشتمانەکەیان بەعێراقەوە لکاند . بەهیچ شێوەیەکیش دەرفەتیان نەڕەخساند تا گەلی کورد بەشێوەیەکی هێمنانە داوای ماف و داخوازیەکانی خۆی بکات . بۆیە پاش ئەوی هەموو ڕێگاکانی لەبەردەم داخرا بەناچاری دەستی دایە چەك و ملی شاخە سەرکەشەکانی کوردستانی گرتۆتە بەر کەپێی ی وابوو لەم ڕێگەیەوە دەتوانێ مافە زەوت کراوەکانی بەدەست بێنێتەوە لەوپێناوەدا چەندین شۆڕشی بەرپا کرد هەر لەشۆڕشی شێخ مەحمود و بزوتنەوە چەکداریەکانی بارزان و شۆڕشی ئەیلول تادەگاتە شۆڕشی نوێ کە لە ساڵی ﴿١٩٧٦﴾ بەڕابەرایەتی یەکێتی نیشتمان هەڵگیرسا لە سەرجەم ئەو شۆڕشانەدا هێزەکانی کورد هەرگیز لەگەڵ هێزی دوژمنان بەرامبەرو هاوسەنگ نەبووە . کورد بێ پشتیوان و بەچەکی خراپ و هێزی میلیشیاوە ، ئەوانیش بەهێزی تۆکمەو پشت

ئەستووړو بە پشتیوانی هەموو جیهان و ئابووریەکی بەهێزەوە تەنانەت لە سەردەمی دەسەلاَتی نەگریسی بەعسیە فاشیستەکان دا کە بە رەشترین دەورانی دەسەلاَتە یەك لەدوا یەکەکانی بۆرجوازی عەرەبی عێراق دەژمێردرێت . چەکی کۆمەڵ کوژ دژ بە ڕۆلەکانی گەلی کوردی بەکارهێنا و پەیڕەوی لەسیاسەتی قڕکردنی مرۆیی و بەسووتماك کردنی خاکی کوردستان کرد . لە درێژەی ئەو شەرو ململانێ سەختەدا زەرەروو زیانی مادی و مەعنەوی و مرۆیی بەرئەو گەلە ئازادیخوازە کەوتووە . هەڵبەتە ئەو هەموو شۆرش و تێکشکان و هەڵسانەوەو بەرەنگاربوونەوانەدا خاك و جەستەی ئەم گەلە دووچاری (نەزیفی) بەردەوام بووە . گومانی تێدانیە کە داگیر کەرانیش لە پێناو زیاتر داتەپاندن و ڕوخاندنی سایکۆلۆجیەتی مرۆڤی کورد و لاواز کردنی کەسایەتیەکەی پەنایان بردۆتە بەر شێوازە هەرە دڕندەو نامرۆڤانەوە بۆ توانەوەی نەتەوەی کورد لە ناو بۆتەی ئایدۆلۆجیای ڕەگەز پەرستی عەرەبی و ڕاگواستن و دەرپەراندنی مرۆڤی کورد لە زێدی باب و باپیرانی و بەکارهێنانی چەکە هەرە کوشندەکانی سەردەم دژی مرۆڤ و ئاژەڵ ژینگەی کوردستان نموونەی هەرە دیاری ئەو سیاسەتەن.. لە ئەنجامی جێ بەجێ کردنی ئەو سیاسەتە شۆڤێنیانەوە مرۆڤی کورد بە هەموو تایبەتمەندیە

نەتەوەیـەکانی خـۆی نـامۆ کـرد.. کاتێـك سـەرەنج دەدەیـن دەبیـنین کەهـەر خـەڵکی نەخوێنـدەوارو ئاسـایی مـل کەچـی سیاسەتی چەوتی داگیر کەران نەبووینە بەڵکو لە هەموو چین و توێژو ئاستە جیاجیاکاندا کەوتنە ناو داوو وپیلان و نەخشەی دوژمنان . سەرەرای ئەوانە دوژمنان هەردەم هەوڵیان داوە گەلی کورد رووبەرووی ترساندن و تۆقانـدن و چاو شکاندن بکەن.. سـەدان شـارو شارۆچـکەو هـەزاران گونـدی کوردەواریـان خاپوور کردو خەڵکەکەیشی لەچەندین ئۆردوگای زۆرە ملێ دەسـت بەسـەر کـران.. بۆیـە دەبیـنین بەشـێك لـە خـەڵکی ئـەو ئۆردوگایانـە لـە بـەر بـێ کـاری و خراپـی گـوزەران چـەکی خیانـەتیان هـەڵگرت و چـەندین نەخۆشـی کۆمەڵایـەتی و دیاردەی دزێو لەناو ئەو کۆمەڵگایانەدا تەشەنەی کرد.

کاریگـەری ئـەو سیاسـەتەو دیـاردە ناشیرنانە بەشێوەیەکی بەرچاو لەدوای راپەرینی مەزنی ساڵی﴿١٩٩١﴾ بەدەر کەوت.. ئەوکاتـە دیـاردەی هەڵکوتانـە سـەر دامو دەزگاکـانی مـیری و ئـاودیو کردنـی کـەل و پـەل و ئـامێرو دەزگاکـان بۆئـەو دیـو سـنورەوە لەبـەر یـەك هەڵوەشـانەوەی بینـاو پـرۆژە خزمـەت گوزاریەکان بەدەر کەوت ... ئەو دیـاردە ناشیرینانە کەدوورن لە رەوشت و رەفتاری مرۆڤی کورد لەگەڵ سەرهەڵدانی ئاگری شـەری کـورد بـەکورد بەکوشـت دانـدا ئەوەنـدەی دیکـە زەقترو

قـولتر بوونـەوە..پرۆسـەی هەڵـسانەوە بوژانـەوەو گـورج کردنـەوزەی کەسـایەتی مرۆڤـی کـورد بەشـێوەیەك بـڕوای بـەخۆی و ئاینـدەی نەتەوەکـەی هـەبیٚ و ببێتـە مرۆڤێکـی هۆشـیاری نیـشتمان پـەروەر.. پێویـستی بەچـاك سـازی و بزوتنەوەیـەکی نوێکـار هەیـە.. کۆبونـەوەکانی پەرلـەمان لـە هەولێرو سلێمانی لە ڕۆژەکانی چوارو هەشتی مانگی ئەیلول وێنەیەکی جوان و بێگەردی نیشتمان پەروەری لە زەین و بیری هـەموو کوردێکـدا نەخـشاند.. هەڵوێـستی نیـشتمانی دەبێـت بەشێوەیەکی سەرانـسەری لـە نـاخ و عـەقڵ و هۆشـی سـەرجەم خەڵکی کوردستان ڕەنگ بداتەوە.

واتە بیر کردنەوە لە ئەرکی نیشتمان ئەمڕۆ و باری دواڕۆژ ببێتـە بەشـێك لەشـێوازی پراکتیکـی ژیـانی ڕۆژانـەی هـەموو کوردێك.. بۆ ئـەوەی بڕواو دڵنیایی خەڵك بەئایندەی خۆیان و گەلەکەیان بگەڕێنێتـەوە دەبێت بڕوامـان بەبەشـداری پێکردنـی زیاتری خەڵکی بیٚ لایەنیش هـەبێت لـە پرۆسـەی بـەڕێوەبردنی دەسـەلأت و ئیـدارەدا هـەڵی جـیٚ بـەجیٚ کردنـی ئەرکـەکلن و سەرخـستنی تاقیکردنەوەکـەش بـدەین جومگـەکانی ئیدارەوحوکم ڕانی لـە کـەم و کورتی خـاوێن بکەینـەوە بەگیانی ڕەخنـەی بنیاتنەرانـە.. دەکـریٚ بـواری زیـاتر یرەخـسێنریٚ بـۆ ئەوەی ڕۆڵەکانی گەل سەربەستانە ڕای خۆیان لەسـەر مەسـەلە

چـارەنوس ســازەکان دەر بـڕن و دەرگاشــیان والآبێــت تــا بەشداربن لەبڕیارو دەسەلآت بۆ ئەوەی بەشداری ڕاستەقینە بن لە قوربانییان‌و خۆ بەخت کردندا.. تاکو ئێساتش مرۆڤی کورد هەست دەکات ئایندەی دیارنیە کارەسات‌و ڕووداوی ترسناك چاوەروانیەتی بۆیە بەتاك و بەکۆمەڵ ڕوو لە هەندەران دەکەن.. واچـاکە ئـەو هەسـتە بکـوژین.. چـونکە ئـەوەی وای کـردووە هەمیشە لە پەراویزو دا بژین‌و لەدڵە ڕاوکێدا بین.. چاومان لـە دەستی ئەم‌و ئەو بێت‌و کەسیەتیمان لاواز بێت ڕەواندنـەوەی ئـەو مەتلرسیانە بەپلـەی یەکـەم دەکەوێتـە ئەسـتۆی سـەرکردە سیاسـیەکانمان‌و ئـەو لایانەنانـەی بایـەخ بەسـتراتیج‌و بـوارە رۆشــنبیریی‌و پـــەرەردەیی‌و کەلتوریـــەکانی کـــورد دەدەن.. ئەوهەڵمەتـەی ئاوەدنکردنـەوەو بوژاندنـەوەی کوردسـتان ئـەو پێــشکەوتن‌و بــەرەو پێــشەوە چــوونەی ڕەوڕەوەی ئاشــتی تاڕادەیەکی باش هاوکێشەی ڕەشبینی بەرەوواژ کردۆتەوە.

ئێـستا پێـچەوانەی جـاران سـتایش‌و شـانازی بـە کـارو چـالاکیەکانی ئیـدارەو حکومـەت دەکرێـت.. کێرفـی متمانـەی جـەماوەری گـەلی کوردسـتان بەرامبـەر حکومەتەکـەی رۆژ لـە دوای رۆژ لـە هەڵکـشان دایـە بـەلآم هێـشتا ڕێگایـەکی دوورو سـەختمان لـە بـەردەم دایـە تـا دەگەینـە ئامـانج.. ئەگــەر بـەراوردیکی ڕەوشــی کـورد لەسـەر ئاسـتی دەرەوە بکـەین

لەمیانی ساڵانی جەنگی ساردو دوای بڕانەوەی ئەم جەنگە دەبینین پێشتر نەك هەر دۆزی گەلەکەمان بووە بەقوربانی ململانێ ی بەرژەوەندیەکانی ئەم لاو ئەو لابەڵکو چەندین گەلی ستەم دیدەو زوڵم لێکراوی وەکو گەلی کورد لە پێناوی ئەو جەنگەدا پلیشابوونەوە.. بەڵام دوای بڕانەوەی ئەو جەنگەو هاتنە کایەی کەش و هەوای دیموکراسیی و مافی مرۆڤ و ئازادیە مەدەنیەکان لە سەرتاسەری جیهاندا چەندین وڵاتی نوێ لە سەر نەخشەی سیاسی.

جیهان دەرکەوتن جگە لەوەی ئەم هەل و مەرجە لەبارەی قۆناغی جیهانگیری و نەزمی نوێی جیهان کە هەرگیز باوەڕی بەپیرۆزی و پارێزراوی سنوورە جوگرافیەکان نیە سنوری نێوان گەلان و میللەتانی جیهانی لێك ترازاند ئیدی کێشەی نەتەوایەتی و ئەتنی و ئاینی زەقتر بوونەوە وەکو کێشەکانی.. بۆسنیاو هێرەزگوڤینیا و کۆسۆڤۆو ناگۆرنۆ کەرەباخ و کێشەی کوردو ئەرمەنەکان و هەرێمە ئاڵۆزەکانی باشوری سودان و بیابانی خۆرئاواو کیوبیك و تیبت و کشمیرو تامیل مۆرۆی فلیپین و باسکی ئیسپانی و ئەمازیغیە بەربەرەکان و قیبتیەکان و ئەسکیمۆکانی کەنەدا.

بەدەرکەوتنی تروسکەی شەبەنگی سیستەمی نوێ ی جیهان.. وردە وردە زەنگی مەترسی نەمانی سیستەمە

کلاسیکیه چەق بەستوەکانی زەمانی کۆن لێدرا . هاوکات لەگەڵ ئەوگۆرانکاریانەدا کۆفی ئەنانی سکرتێری گشتی نەتەوە یەککگرتوەکان لە خولی پەنجاو چوارەمیدا لە ساڵی ١٩٩٩ پرۆژەی دەست تێوەردانی مرۆیی نیو دەوڵەتی ﴿التدخل الانسانی الدولی﴾ خستە بەردەم کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەککگرتوەکانەوە..

ئەم بیرۆکەیە مەودای چەمکی کارپێکراوی سەروەی نیشتمانی﴿السیادة الوطنیة﴾ زۆر تەسك کردەوەو تەنانەت خستیە پەراوێزەوە.. هەمووشمان ئەو ڕاستیە دەزانین کە لەژێر پاساوی﴿سەروەری نیشتمانی﴾ دا جاران بواری بەدەیان دەوڵەتی دیکتاتۆری‌و تۆلیتاری دەدا تا بیٚ باکانە مافی کەمینە ئاینی‌و ئەتنیکیەکانی ناو سنووری ووڵاتەکەیان پێشێل بکەن.

دیارترین نمونەی پڕاکتیکی مەبدەئی دەست تێوەردانی مرۆیی لەم چەند ساڵەی دوایدا لە هەرێمەکانی کۆسۆڤۆو تەیموری خۆرهەلآت ڕەنگی دایەوە.. مایەی سەرەنجیشە پشتگیری کردنی نێو دەوڵەتی لەبریاری﴿٦٨٨﴾ی ئەنجوومەنی ئاسایش وپێکهێنانی﴿نوای ئارام﴾ لە پرۆسەی پرۆڤاید کۆمفۆرد ڕچەشکاندنێکی ئەزموونی پرۆژەی دەست تێوەردانی مرۆیی نێو دەوڵەتی بو لە کوردستان مووژدە

بەخشینە بۆ ئایندەی گەلی کورد لە عێراق دا تاچیتر لە تاریکستانی چەمکی سەروەری نیشتمانی و بڕو بیانووی ناوەخۆی دەوڵەت و سیستەمی ئایدۆلۆجیا کورد هاوشێوەی نەچەوسێنەوە..

بەدرێژای مێژوو هەرگیز هۆکاری دەرەکی بەقەد قۆناغی ئێستا لە بەرژەوەندی دۆزی کورد نەبووە ئەمڕۆ کوردستانی عێراق جوان ترو چاکتر لە جاران کەوتۆتە ناو شاشەی بەرژەوەندیە سیاسی و جیۆ ئیکۆنۆمیکەکانی ئەمریکاوە کەلەسێ ڕوانگەوە سەرچاوە دەگرن..

١- بواری هەڵکەوتەی جیۆپۆلەتیکی کوردستان دەکەوێتە هەرێمێکی بایەخ داری جیۆئیکۆنۆمیکەوە بەتایبەتی﴿نەوت – ئاو – کانزاکان﴾ ئەم بوارانەش لە دوای جەنگی ساردەوە بونەتە تەوەری سەرەکی ململانێکان.

٢- بواری ململانێی شارستانیەت﴿صراع الحضارات﴾ هەڵکەوتەی کوردستان لەم بوارەدا شوێنێکی زۆر گرینگەو لەدەروازەی جیۆپۆلەتیکەوە دەکەوێتە نێوان هەریەك لە شارستانیەتی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات.

٣- گەلی کورد دەمێکە گیرۆدەی کاری تیرۆرستی بۆتەوە، بەڵام لە دوای ڕوداوەکەی نیویۆرك و واشنگتۆن گەلی کورد بووە بەشێك لەو بەرەیەی کەدژی تیرۆری نێو دەوڵەتی پێك هاتووە..

ئێستا ئەمریکییەکان بەدیقەتەوە ئەو ڕۆڵەی کورد هەڵدەسەنگێنن.. تەئکید کردنەوەی کۆڵن پاولْ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە بروسکەی پیرۆزبایدا بەبۆنەی بەستنی کۆبونەوەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان کاتێک دەڵێ﴿شانازی بەوەوە دەکەم کەئێوە لە شەریکەکانی ئەمریکان لە شەری دژی تیرۆریزمداو لە تێڕوانینمان بۆ ئایندەی عێراق بەشداریمان دەکەن﴾ هەڵبەتە ئەم قسانەی کۆڵن پاولی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا گەورەترین‌و قورسترین وولاتی جیهان ئەوە دەگەیەنێت کە کورد لەبەرەی دژە تیرۆریزمدایە وهەرزیانێك لە ئێمە بکەوێت دەکاتە زیان گەیاندن بەشەریکەکانی ئەمریکاو ئەمریکاش لە وە بێدەنگ نابێت.

## ئەمیر دڵبەند

### سەربازێکی نەناسراوی ئەم شارە

بەهاری ساڵی ١٩٨٥ بوو، هەورە خۆلەمێشیەکان لە ئەوینێکی شێتانەدا، ئامێزیان بەچیاکانی ماکۆك‌و هەوریْ داکردبوو، ترپەی باران‌و خوڕەی جۆگە پێچاو پێچەکان سەدای سیمفۆنیایەکی سروشتیان لە دۆلەڕەشپۆشەکەی بالیسان بلاْو دەکردەوە.

ئێمە دەستەیەك لە پێشمەرگەكانی تیپی(٩٣)ی كۆیە، لە دەست تووڕەیی باران، خۆمان لەژێر گوێسەبانەی ماڵە جوتیارەكانی گوندی(زیخان) حەشاردابوو، كتوپڕ چەند پێشمەرگەیەك كە هەموو جەستەیان بە هۆی بارانەوە تەڕ ببوو، خۆیان گەیاندە ژێر ئەو نوایەی ئێمەی لەباران پاراستنوو، دوای چاكو چۆنیو سلاْو لێككردن.. بۆم دەركەوت یەكێك لەو پێشمەرگانە كاك(ئەمیر مستەفا) بوو، كە برای شەهیدی قارەمان(مشیر مستەفا)یە ئیدی لەو ساتە وەختەوە تا ئەو ڕۆژەی بە نەخۆشی كۆچی دوایی كرد بالاْنسی پەیوەندی دۆستانەمان هەر لە هەڵكشاندابوو،بەهۆی ڕوح سوكیو ڕەفتاری جوانو قسە خۆشەكانیەوە، هەر زوو سەرەنجی دەورو بەرەكەی بەلای خۆیدا كەمەندكێش كرد.

لە ڕۆژانی سەختو دژواردا كە ڕژێم نەخشەی لە ناوبردنی گەلی كوردی جێبەجێ دەكرد، بنەماڵەی كاك (ئەمیر) دوو برای تری بە ناوەكانی(زرار و مشیر) لە سەنگەری بەرگری دا بوون، لە دژی ڕژێمی كۆنە پەرستی بەغدا، كاك(مشیر) فەرماندەی مەفرەزەیەك بوو لە تیپی ٩٣ی كۆیە. لە شەڕە بەناوبانگەكەی (بەنەباوێ) تا دوا فیشەك بەرگری لە مەترێزەكەی خۆی كرد.. ئینجا گلا.كاك (ئەمیر دڵبەند) سەرەڕای ئەوەی ڕۆحە پەپولەیەكەی تەژی بوو لە وورەو بروا بوون بە مافی كوردان..

دەستی شیعر نوسینی هەبوو، بەهۆی دژواری هەڵومەرجی نیشتمانەکەمانەوە، زۆربەی شیعرەکانی لەناو چوون، چەند پارچە شیعرێکی لە پاش بەجێ ماون، کەهی سەردەمی دوای راپەرینە. ئەمانەی خوارەوە نموونەیەکی لەو شیعرانەیە:-

رێبوارەکان
بەم تاریکیە
بۆ کوێ ئەچن ؟
بوخچەی.......زامی منداڵەکان
بۆکوێ ئەبەن؟
رێبوارەکان
گەر ئەتانەوێ
بە دەروازەی سنوور بگەن
مشتێ لە خۆڵی کوردستان
هەڵگرنەوە.....
ماچی بکەن
ئەوسا ئەتوانن تێبگەن
بۆ کوێ ئەچن...؟

# ئاشەکانی کۆیە

زوو کۆیــە مەڵبەنــدێکی ســەنگینی بازرگــانیو کــشتوکاڵی ناوچــەکە بــوو، جوتیــارانی دەشــتی کۆیــەو کاروانــچی شــارە گونــدە دوورو نزیکــەکانی ئــەم ناوچــەیە، کــاڵاو بەرهەمــەکانیان لێرە ساغ دەکردەوە پێداویستیەکانیشیان هــەر لێرە بەدەست دەهێنــا، بــۆ حەوانــەوی ئــەم ڕێبــوارو کاروانــچیانەش چــەندین خــانی گــەورە گــەورە لــە جیــاتی ئوتێــلو مۆتێلی ئــەم ســەردەمە دروست کرابوون وەکو: خانی مەحمود ئاغاو زبێدەو چەلەبیو خــانی قــادر یاســین هتــد... لــە پانتــایی بازارەکــانی کۆیــەدا جۆرەهــا پیــشەی دەســتی بــڵاو ببــۆوە وەکــو:- دارتاشــی - زەڕەنگەری - خــمچێتی - لبادچێتی - دەباغــچێتی - جۆڵایی - ســۆڵ دوری و لێــف دوری - ئاشــەوانی هتــد... بــەهۆی گرینگی پیشەی ئاشەوانی و پەیوەست بوونی ڕاستەوخۆی بە ژیانی ڕۆژانەی هاوڵاتیانەوە، لێرە ڕووناکی دەخەینە سەر ئەو بابەتە، کە ئاشەکانی کۆیەیە:

## ئاشە ئاویەکان

ئێستا مەگەر ئاسەواریان مابێ، ئەگینا بڕواناکەم ئەم جۆرە ئاشانە نەك هەر لە کۆیە، بەڵکو لە کوردستانیش مابن ..!
ئاشی ئاوی هەمیشە لە ڕۆخ چەم و جۆگە و ڕووبارەکان دامەزراون، لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان ئەم جۆرە ئاشانە هەبووە، سەرەتا شوێنێکی گونجاویان دیاری دەکرد بەتایبەت لە شوێنێکدا کە ئاو بەسانایی بیگەیشتبایە، ئەو کەرەستانەی خوارەوە بەشە سەرەکیەکانی ئاشی ئاوی بوون:- بەردی ئاش(بەرداش)- بستە - خوانگە - خەردار - چەقەنە - چەرمەخۆرە - پەڕەکە - تەنووری ئاش - ئاردکێش - ئاوبڕ.
هەموومان دەزانین لە هەموو وەرزێکی ساڵ ئاوێکی زۆر لە حەمامۆکەوە دەهاتە خوارەوە، بۆیە سەرەنج دەدەین هەر لە کۆنەوە ژمارەیەکی زۆر ئاشی ئاوی لەسەر ئەو چەمە دروستکرابوو، لە سەرچاوەکەوە تا دەگاتە گەڕەکی ئاشان لە ڕۆژهەلاتی کۆیە. ئەوانەی خوارەوەش بەشێکن لەو ئاشانە:-

١- ئاشی حەمامۆك.
٢- ئاشی گێوژۆك.
٣- ئاشی ئاغەڵی.
٤- ئاشی کەندە کۆخ.

٥- ئاشی قادر حسێن.

٦- ئاشی شانشکای.

٧- ئاشی ساغه.

٨- ئاشی مەلابەکر.

٩- ئاشی خنه.

١٠- ئاشی گەڕەکی ئاشان.

١١-ئاشی دەباخان.

١٢- ئاشی شیلکه.

١٣- ئاشی پیسکان.

ئاشەکانی تۆبزاواو و هەرمۆته:-

١- ئاشی مام برایم.

٢- ئاشی کۆن.

٣- ئاشی حاجی جەلیل.

٤- ئاشی کەریم ئاغا.

٥- ئاشی چوارباغ.

٦- ئاشی مەلاموسا.

٧- ئاشی ناو زەوی خواجه کەریم.

٨- ئاشی دیانان.

٩-ئاشی مزه.

## ئاشی ئاگر

وەکـە ئاشـکرایە تەمـەنی ئاشـە ئاویـەکان زۆر کـۆنترە لـە تەمـەنی ئاشـە ئاگرینـەکان، سـاڵی ١٩٢٨ز حـاجی کاکـەمین کەبازرگانێکی ناسراوی کۆیە بوو، لە موسڵەوە یەکەمین ئاشـی ئـاگری هێنایـە کۆیـەو لـە خـوار قـشڵە دایمەزرانـد ئـەو ئاشـە ئاگرینە لەو ساڵەوە بێوچان لە کارکردن دایە. خـەڵکی کۆیـەوە دەوروبەریـشی بـەردەوام سـاوەر و بـرۆێش و گـەنمـە کوتـاوو چەڵتوکیان پـیٚ لێکـردووە. سـاڵەهای سـاڵە ئـەو ئاشـە لەلایـەن (مام خدر)ەوە بەڕێوە دەچێت، خەڵکەکەی ئێرە ئاردی ئاشـی ئاویـان پـیٚ چاکترو باشـترو جوانتر بـوو لـە چاو ئـاردی ئاشـی ئاگر.

## خانوە قوڕەکان

گومـانی تێدانیـە ژیـانی مـرۆڤ لـەم سـەردەمە زۆر گـۆڕاوە لـە چاو ژیـانی دوێنـیٚ.. بـە تایبـەتی لـە ڕووی پۆشـاک و خـۆراک و نیشتەجێبوونەوە کە هەمیشە بایـەخێکی زۆری پێدراوە.. هـەر ئـەو بایـەخ پێدانەیـە مرۆڤـی لـە ژیـانی نـاو ئەشـکەوت و دارسـتانەکانەوە گواسـتەوە نـاو باڵەخانـەو تـاوەرە هەوربڕەکانەوە..! گەر لاپەڕەکانی مێژووی دوێنێی ئەم شارە

بخوێنینەوە بۆمان دەردەکەوێت لە چەند گەڕەکێکی بچووك پێك هاتبوو: قەلاتو هەوارو بەفری قەندی و بایزاغا بوون..!
جۆرو شێوازی خانوەکانیش کۆنو لە خشتو قوڕ دروستکرا بوون.. کۆلانەکانیشی تەسكو نارێك بوون ، مەرجی تەندروستیشیان کەمترتێدا نەبوو.

## خانوو دروستکردن:-

هەرکەسێك خانووی دروستبکردایە، وەستای کارامە هەبوون، سەرەتا بناغەیان لێدەداو ئینجا بەکوتەکێکی قایمو پتەو، کە لە دارگوێز پێك هاتبوو، بەدەستی چەند کرێکارێکی مەچەك ئەستوور بۆ ماوەی چەند رۆژێك بناغەیان دەکوتاو دەیان پەستایەوە، ئینجا دیوارەکانیان بەخشت و قوڕ بەرز دەکردەوە، پاشان بەدارو پووش قامیش سەریان دەگرت، دوایی قوڕەبانیان کردووە، لە پایزدا بەچینە قوڕێکی ئەستوور سەریان سواغ داوە، هەموو ساڵێکیش پێش باران بارین سەرلە نوێ ئەو بانانەیان سواغ داوەتەوە.

ئەو دەم لە ژوورەکاندا تاقچەیان دروست دەکرد، خەڵکانی زەنگین بنمیچی ژوورەکانیان بە تەختە رێك دەخست، ئینجا کاریتەیان دادەنا، سەربانەکانیشیان بەقوڕێکی تێکەڵ بە(کا) بە ئەستوورایی(٥-١٠سم) سواغ دەدا، بەدەگمەن گەرماو لە

مالأن دا هەبوو، خەڵك بۆ خۆشۆرین دەچونە گەرماوەكانی شار وەكو: گەرماوی پیسكان و حەسەن ئاغاو ناوەندی .

لەماڵەكانیش تاكو تەراثاو دەست هەبوو.. لە كاتی پێویست پیاوان دەچوون بۆسەر رووباریاخود مزگەوتەكان، ئافرەتانیش دەچوونە قولەتێنەكانی شار وەكو: قولەتێنی شێخ سمایلی مەلا خالید، قولەتێنی سیسە، قولەتێنی ماڵی مستەفا ئاغا، قولەتێنی خەلیفەی عەودالأن، شار لە هاویندا نیمچە چۆڵ دەبوو، بەهۆی ئەوەی زۆرینەی خەڵك دەچوونە گوندەكان، یاخود سەر رەزو باخەكانیان. لە وشارەدا سیستەمی دابەشكردنی ئاوی خواردنەوە ئێجگار سەرەتایی بوو، ئاو لە حەماموكەوە بە جۆگە دەهاتە خوارەوەو بەبەردەمی ماڵی مامەند ئاغا رەت دەبوو، پاشان بە چەندین جۆگەی لاوەكی بەسەر گەرەكەكان دابەشكراوە.. ئەوكات شار بەشورەیەك دەور درابوو، كە بەگەچ و بەرد هەڵچنرابوو، چەند دەرگایەكی گەورەی هەبوو، بۆ هاتوچۆی خەڵك و كاروانچییەكان، دەرگاكانیش ئەمانە بوون:-

١- دەركی گەرویَ یاخود سورکیَ لە گەرەكی بەفری قەندی دەیروانیە دەشتی كۆیە.

٢- دەركی قۆنگرە، لە گەرەكی هەواوان بەرامبەر هەیبەت سوڵتان

٣- دەرکی خۆشناوان، لە گەڕەکی بایزاغا دەیروانیە ناوچەی خۆشناوەتی.

٤- لە گەڕەکی قەلاتیش دەرگایەك بەئاراستەی هەولێر هەبوو.

## سێوە دەنگێکی خەماوی و ئاوازێکی نەمر

کۆنفۆشیۆس دەڵێ((گەر دەتەوێ پلەی پێشکەوتن و شارستانیەتی هەر گەلێك بزانیت، گوێ لە موزیك و گۆرانیەکانی بگرە)).

کۆیە یەکێکە لەو شارانەی کوردستان، کە لە ڕۆژگارێکی زووەوە، جولانەوەیەکی هونەری ئاوازو گۆرانی تێدا درووست بووە، بە بیرو بۆچونی ئێمە، سەرهەڵدان و گەشەکردنی ئەو شێوازەی هونەر،بەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ هاندان و پشتیوانکردنی چینە دەست ڕۆیشتووەکەی ئەوسای شارەکە بۆ هونەر..!

مرۆڤ کە سەرەنج دەداتە پیاوێکی وەك(ئەمین ئاغای ئەختەر)ی شاعیرو هونەرمەند، ئەو ڕاستیەی بەجوانی بۆ بەدیار دەکەوێت، (ئەختەر) کەسایەتیەکی دیاری شارەکە بوو، سەروەت و سامانێکی زۆری لە کۆڕی ئەدەب و ئاهەنگدا سەرف کرد، لە دیوەخانەکەیدا هەرگیز چرای ئەدەب و

چریکەی گۆرانی و سەدای مۆسیقا خامۆش نەدەبوو..! گەرچی ئەو بزوتنەوە هونەرییە بەر لە ئەختەر هەر هەبووە، بەلأم لە رۆژگاری ئەودا ئەدەب و هونەر هەرمێنیان زیاتر پەیداکرد، دواتریش دەیان شاعیرو هونەرمەند درێژەیان بەو کاروانە پیرۆزە داو بەرەو پێشیان برد.

گومانی تێدا نیە، سێوەی هونەرمەند درێژە پێدەری ڕێبازو ڕێچکە هونەریەکەی ئەختەرو نەشئەتی ڕەشید ئاغای حەوێزیە.. کاتێك سێوە باوکی دەمرێت.. بۆ دابین کردنی ژیان و گوزەرانی.. دەبێتە شاگردی(خواجە یوسف )ی جۆلاً.. لە میانەی کارکردنیدا گیرۆدەی ئەوینی(واریێ)ی شۆخ و شەنگ دەبێت، کە کچی وەستا یوسفی جۆلأیە، لێرە بەدواوە وەچەرخانێك لە ژیانی ئەو گەنجە هەست ناسکە ڕوودەدا.. بەوەی گڕی ئەو ئەوینە دەبێتە مایەی تەقینەوەی سەرچاوەی بەهرەی هونەری سێوە ، کە لە ڕێگەی مەقام و گۆرانیەوە دەری دەبڕی، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ سۆزی ئەو خۆشەویستیە ئەو دوو عاشقە لە یەکتر نزیك دەکاتەوە..! ئەوەش وا لە سێوە دەکات، داخوازی واریێ لە باوکی بکات، بەلأم داب و نەریتی دواکەوتوی کۆمەڵگەی ئەو سەردەمە بووە بە کۆسپ لەبەردەم بەیەکگەیشتنی ئەو دڵدارو دولبەرەدا.. ئیدی لە داخان سێوەی هەژارو نەدار ماڵی وەستاکەی جێدێڵێ، ساڵ دەسوڕێتەوە

واریَ بەکەسەری دابڕان‌و جودایی سەردەنێتەوەو سێوەی سەرگەدانیش ، شێوەی واریَ ی لیَ دەبێتە سەراب و بێهودە بەدوایدا دەگەڕێت.

زۆر جار لێکدابڕان‌و جودایی ئەویندار‌ی بەسودی ژانرێکی ئەدەبی یان هونەری تەواو بووە، ئەمە ڕێك لە ئاکامی ئەو دابڕانەی سێوەو واریَڕوویداوە، هەناسەساردی سێوەو دڵشکانی لەو ڕووداوەدا، سەراپای ژیانی ئەو گەنجەی بە ڕەشبینی و خەم و بێزاری ڕەنگرێژ کرد.

خالە سێوە لە کاتی دانیشتنی تایبەتی ماڵان‌و ناو ڕەزان، وە لە ئاهەنگە جەماوەریەکاندا یاخودلە دیوەخانەی مەلا حەویز ئاغاو کاکە زیادو مەحمود ئاغادا، مەقامی بەسۆزو بەستەی ئەوینێکی ڕاست و دروستیان لە قوڕگە زێڕینەکەیەوە هەڵدەقولاَ..! بەهۆی دەنگە خۆشەکەی‌و دەست پاکی‌و دڵپاکیەوە، متمانەوە باوەڕی بازرگان‌و دەوڵەمەندەکانی بۆخۆی راکێشابوو ، لەبەر ئەو هۆکارانە بازرگانەکان کردیان بەحسابگری کاروبارەکانی خۆیان..! جگە لەوەی دەنگ خۆش‌و مەقام زان بوو، قسەی خۆش‌و نوکتەزانیش بووە.

هەر بەهۆی دەنگ خۆشی‌و سیفەتە جوانەکانیەوە دۆست و هاوڕێی زەکی ئەحمەد هەناری و شەفیق سایر و تایەر تۆفیق و حەمە گەمحان و بیلال بەهادین‌و مامۆستا ئەحمەد

دلـزارو كـريم شـارەزابوو بـە بۆچـونی ئەوكەسـانەی سـێوەيان ناسيوە، ژمارەيەكی زياتری بەرهەمی هونەری هەبوە، بەڵام لەو ڕۆژگـارەدا تاكـە سەرچـاوەی تۆمـاركردنی كـارە هونەريـەكانی سێوە لە ڕێگەی ڕيكۆردەرەكەی خواليێخۆشبو﴿حەمە گەمحان﴾ وە بـووە، كـەزۆر شـەيدای بيـستنی گۆرانيـەكانی هونرمەنـدی ميــسری﴿أم كلثــوم﴾ بــووە، هــەركاتێكيش گۆرانيــەكی ئــەو هونەرمەمدە پێشكەش بكرايە.

حەمـە گـەمحان هەركاسـێتێكی لەبـەر دەسـت بوايـە، ئـەو گۆرانيەی تۆمار دەكرد، گومانيش دەكرێت پێشتر ئەو كاسێتە مـەقام يـاخود گۆرانيـەكی سـێوەی لـە سـەر تۆمـار كرابـێ.. گـۆرانی و ئاوازەكـانی سـێوە سـتايلێكی تايبـەتيان هەيـە كـە ڕەنگدانـەوەی بێگـەردی كۆمـەڵگای ئەوسـاو ئاوێنـەی ژيـانی سێوەو ژێيەكانی قوڕگی زێڕينی ئەو بوون.. هەر لەبەر ئەوەشە كەسـێكمان نـەبينيوە تـوانيبێتی بـەجوانی لاسـايی ئـەوی كردبێتەوە.. هەروەكو چۆن مەقام و گۆرانيەكانی كۆيە مۆرك و شــەقڵێكی جياوازيــان بەبــەراورد لەگــەڵ هونــەری گــۆرانی ناوچـەكانی ديكـەی كوردسـتان هەيە.. بەهـەمان شێوە ئـاوازو گۆرانيەكانی سێوە بەو بەرهەمـە كەمـەی ژيانی كـەژمارەيان لـە پەنجـەكانی هـەردوو دەسـت تێپـەڕ ناكـەن جياوازيـان لەگـەڵ بەستەو گۆرانيەكانی ديكەی هونەرمەندانی كۆيە هەيە بەهۆی

ڕەســـەنایەتیانەوە خــۆی لـــە قـــەرەی هونەرمەنـــدانی ڕیـــزی پێشەوەی گۆرانیو میوزیك دەدا.. بەڵام بەداخەوە وەکو چۆن هونەرمەندانی نەوەکانی دوێنێی گەلەکەمان هەمیشە گیرۆدەی هــەژاریو بەربــەرەکانی کۆنەپەرســتان دەبوونــەوە.. دەبیــنین سێوەی لوتکەش لەئاخرو ئۆخری ژیانیدا هەژاریو نەخۆشی بڕستیان لێ بڕی، ئەوە بو لە تەمەنی حەفتاو سێ ساڵیدا بۆیەکجاری ماڵئاوای لێ کردین.

## وڵاتی خۆر

لەگـــەڵ ئـــەوەی لـــە ڕیـــزی هـــەرە پێـــشەوەی وڵاتـــە پێشکەوتوەکانی جیهان دایە، ئەندامیشە لە کۆمەڵەی هەشت وڵاتە پیشەسازیەکانی جیهان، لە گەڵ ئەوەشدا لە ڕابردووی خــۆی دانــەبڕاوەو پابەنــدە بــەداب و نەریتــەکانی بــاب و باپیرانیــان. بەشــێوەیەکی دیکــە، جیهــانگیری نەبۆتــە هــۆی تێکــدانو شــێواندنی کــەلتوورو ژیــانی کۆمەڵایــەتی وولاتــی ژاپۆن.

لەڕووی گەشەسەندنی ئابووری پێشکەوتنی تەکنەلۆجیا پێـی ناوەتـە قۆنـاغی شۆڕشـە زانیارییـەکان، ئـەم پێـشکەوتنە مەزنـــەی ژاپـــۆن ســـەرەنجی هـــەموو جیهـــانی بـــۆلای خـــۆی ڕاکێشاوە، ئێمـە ئەگـەر پـلانو نەخشەوهەوڵی جدیمان هـەبێ

دەتوانین سوود لە ئەزموونی ژاپۆن وەربگرین.. زانیاریەکی چەوت لەناو خەڵك بڵاوبۆتەوە ، گوایە ئەوگەشەسەندن و پێشکەوتنە ئابوریە مەزنەی وولاَتی ژاپۆن دەگەرێتەوە بۆ کۆتایی جەنگی دووەمی جیهان، بەلاَم کاتێك لاپەڕەیەکی مێژووی ئەم گەلە زیندووە هەڵدەدەینەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ژاپۆنیەکان هەر لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە دەستیان کردووە بە شکاندنی کۆت و بەندی دواکەوتن و وا بەستەیی و هەنگاو هەڵهێنان بەرەو جیهانی شارستانی و دیموکراسی و پێشکەوتنەوە

## گەڕانەوە بۆ سەرەتاکان

ساڵی ١٨٢٥(پیری) کە ژەنەڕاڵێکی گەورەی ئەمریکی بوو، بۆ یەکەم جار پێی خستە سەر کەنارەکانی ژاپۆن، هەنگینیٚ ژاپۆن بەدەست ڕژێمی(تۆکوغاوا) دەینالاَند، ئەو ڕژێمە لە ساڵی ١٦٠٣تا ساڵی ١٨٦٧ جلەوی دەسەلاَتی ئەو وولاَتەی بەدەستەوە بوو، ئەو ژەنەرالّە ئەمریکییە ڕژێمی تۆکوغاوای ناچار کرد، تا دەست بەرداری گۆشەگیری بیٚ و دەرگای بازرگانی ئازاد بە ڕووی ڕۆژئاوا بخاتە سەرپشت، پیری لەگەلٚ خۆیدا ژمارەیەکی زۆر کتێب و چاپەمەنیەکانی بواری بیرکاری و زانستە مرۆییەکانی هێنابوو.

سیاسەتی کرانەوەی بازاڕی ئازادو هێنانی ئەو ژمارە زۆرەی کتێبو چاپەمەنی لەگەڵ ئەم فاکتەرانی خوارەوە ئاوێتەی یەکتر بوونو زەمینەیەکی لە باریان ڕەخساند بۆ ئەوەی ژاپۆن لەو گۆشەگیریەی بێتە دەرەوە و لەئەنجامدابگاتە ئەو ئاستە بەرزەی پێشکەوتن ، کەهەموومان ئاگادارین.

١- کاریگەری ئاینی کۆنفۆشیۆسی شوێنەواری قوڵی لەسەر ڕەفتارو ڕەوشتو هەڵسوکەوتی ژاپۆنیەکان نەخشاندبوو، بەتایبەتی بۆ هاندانی خەڵك لە بواری پسپۆڕیو وردبینیو بنیادنانەوەی کۆمەڵگەی ئوستۆکراسی.

٢- مرۆڤی ژاپۆن کارکردنی زۆر بەلاوە گرنگو پیرۆزە، بۆیە ئەو دڵسۆزیەیان لە بواری بنیاتنانەوەدا گەلێك ئەنجامی باشی لێهاتە دی .

٣- هەموو ژاپۆنیەك بەچاوی باوك(سەرەك خێزان) سەیری (ئیمپڕاتۆر) دەکەن، هەڵبەتە ئەم هۆکارەش بووە مایەی پابەند بوونی مرۆڤی ژاپۆنی بە کۆمەڵگەکەیەوە و پتەوە بوونی گیانی هەرەوەزی و هاوکاری لەنێوان گەلی ژاپۆنی.

٤- جگە لەوە بوونی پەیوەندیەکی ڕۆحی دەگمەن لە نێولن چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگە .

٥- گواستنەوەی ئەزموونو شارەزاییەکانی ئەوروپا، کەپاشان چەندین میتۆدو بیرو ڕای جۆراو جۆری لێکەوتەوە

٦- بلاْوبوونەوەی زانستو زانیاری و هۆشیاری میللی

## سەردەمی زێڕین

لە ئاکامی بڵاوبونەوەی هۆشیاری ڕۆشنبیریەوە، ژاپۆنەکان گەیشتنە ئەو ڕاستیەی کە شەڕکردن بە کەسێك ناکرێت، کە شیری پۆڵاین و گورزی گەورەی هەڵگرتبێ، بەرامبەر ئەو کەسەی چەکی پێشکەوتوو زانستی ڕۆژئاوای هەبێ، لە بەر ڕۆشنایی ئەو ڕاستیەی سەرەوەڕیفۆرمخوازەکان تەنیا لە میانەی بیست ساڵدا، توانیان تەپ و تۆزی چەندین ساڵەی دواکەوتن و کۆشەگیری لە جەستەی شەکەتی ژاپۆن دابتەکێنن.

سەرەنجام توانیان دیدو بۆ چوون و ئەجیندای خۆیان بسەپێنن، دوای زیاتر لە سەدەو نیوێك(گۆربا چۆف)ی سەرۆکی پێشوتری ڕوسیا لە سەر هەمان ڕێبازی گەشەسەندنی ژاپۆن ڕۆیشت، بەڵام دیارە هەرگیز مێژوو کتومت خۆی دوبارە ناکاتەوە، ئەگەر دووبارەیش بێتەوە ئەوا بەشێوەیەکی کاریکاتێری دەبێت بۆیە دەبینین هەڵکەوتنی(گۆربا چۆف) نەك هەر نوشستی هێنا، بەڵکو پەیکەری یەکێتی سۆڤیەتیش لەباریەکیش هەڵوەشایەوە..

مرۆڤ لە ئاست تاقیکردنەوەی ژاپۆنیەکان دەستەوەستان دەبێ و نیشانەیەکی گەورەی سەرسورمان لە بەر دەما زەق

دەبێتەوە.. تۆ دیقەت بدە وولاّتێك بەبێ پێشینەیەکی سیاسی دیاری کراو و پلانێکی ئابووری و هاوکاری کردنی وولاّتان، بێ ئەو پشتیوانیە چۆن توانی ئەم ئاڵوگۆڕە قوڵە ئەنجام بدات..!!!

(ڕامان لە چەند وێستگەیەکدا)

دوای تێپەڕبوونی چەنجا ساڵ بەسەر جەنگی دوەمی جیهانیدا، کە ژاپۆنیەکان قورسترین زەبریان بەرکەوت ، کەچی چەند ساڵێك دوای ئەو جەنگە کاولکاریە، وردە وردە ژاپۆنیەکان برینەکانیان سارێژکرد.. هەر بەوەش نەوەستان، بەڵکو ئەمڕۆ ژاپۆن لە ریزی هەرە پێشەوەی وولاّتە پێشکووتوەکانی جیهاندایە.. لە ئێستادا کۆمپانیای(تۆیۆتا مۆتۆرن)ی ژاپۆنی لە ساڵی پاردا ژمارەی پێوانەی تۆمارکرد، بەوەی فرۆشیەکانی ئەو کۆمپانیایە لە ئۆتۆمبیلی جۆری(الگوس الفاریە) لە بازارەکانی ڕۆژئاوا بەرێژەی(٢٥٪) زیادی کردو قازانجەکەشی گەیشت(٨٠٨) ملیار دۆلار، هەروەها داهاتی کۆمپانیای(تی تی ئین) بۆ تۆری تەلەفزیۆنی بێتەل لە هەمان ساڵدا گەیشتە ترلیۆنێك دۆلار لە ساڵی ١٩٨٤ دا ئەمریکا هەشت ملیۆن ئۆتۆمبێلی بەرهەم هێنا، بەلاّم تەنیا

دوو ملیۆنی فرۆشرا، کەچی ژاپۆن لە هەمان ساڵدا هەمان ژمارەی بەرهەم هێنا، کەچی چوار ملیۆنی لێفرۆشت.

ئەمڕۆ ژاپۆن۳۰٪ هەموو بەرهەمی ئۆتۆمبیلی جیهان پێك دەهێنێت.. بەپێی ئامارێك کەرێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکان ئەنجامی داوە.. دەرکەوتوە هەرماڵێکی سەر ئەم زەویە لانی کەم پێنج ئامێری کارەبایی ژاپۆنی تێدایە، جگە لەوە٨٤٪ بەرهەمی جیهانی کامێراو ٨٣٪ بەرهەمی سەعاتو ٦٦٪ بەرهەمی تەلەفزیۆنی هەموو جیهان بەرهەم دێنێت.. بەڕاستی پێشکەوتن و داهێنانەکانی ژاپۆن هەموو جیهانی سەرسام کردووە.

## کلاّو ڕۆژنەیەك لە سەر تیپی موزیکی باواجی

لە دێرینەوە گەلی کورد موزیكو گۆرانیو هەڵپەڕکێی خۆی هەبووە، لە سەردەمی زەردەشتەوە، موزیك لە پەرستگاو سرووتە ئاینیەکان لەگەڵ سروودی ئاینی دەژەنرا، ئامێرە موزیکە ڕەسەنەکانی ئەو ڕۆژگارە.. نای تەنبوورو دەهۆڵو زورنا بوون ، دواتر ئاینەکانی ئێزیدی.. ئەهلی هەقو ئاوازو موزیکیان ئاوێتەی ستایشو شیعر کرد، بۆ دەربڕینی سۆزو نیازە ئاینیەکان، لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ساسانی موزیك، ئاوازی کوردی بە هەنگاوی خێرا چووە پێشەوە، تەنانەت

دوای بلاْوبونەوەی ئیسلامیش موزیك لە شێوازی پیاهەڵدان و ستایش هەر بەردەوام بووە ، نوسەری فەرەنسی(بلاْو) کە بەشێکی زۆری کوردستان گەڕاوە، دەربارەی موزیك و گۆرانی کوردی دەڵێت (هەژارترین هۆزی کورد لە ئاواز و ئاهەنگی دڵنەوازدا دەوڵەمەندە، گەلێك داستان و بەسەرهاتی قارەمانیەتی بەرز و چیرۆکی ئەویندار لە نلوچە دڵگیرو جوانەکانی کوردستان سەداو ئاوازەکانیان دەنگ دەداتەوە، جگە لەوە چەندین پسپۆر و شارەزای بوارەکانی هونەر ئامێرەکانی تەنبوورو عودو کەمانجە بۆ کورد دەگەڕێتەوە.

## پێشکەوتنی بەهرەی هونەرمەندێك

دەمێکە جولاْنەوەیەکی هونەری لە ناخی ئەم شارە جۆشی داوە، لەگەڵ بەرەو پێش چوونی ڕۆژگار ئەو بزافەش نەشونمای کردووە، بەشێوەیەك ئاوازو هونەر مەقاماتی سنوری ناوچەی کۆیە مۆرکێکی تایبەت بەخۆی ڕەنگ ڕێژکردووە گەلێك مەقامزانی گەورە وەك، مەربین و نەشئەتی رەشید ئاغاو پوتی و حاجیە گەورەو عەبەی چایچی و مەلائەسعەدو سیوەو تایەر تۆفیق لێپەیدا بووە، هەرکاتێك بمانەوێ قسە لەسەر ئاواز و موزیکی کوردی بکەین، دەبێ ئاوڕێك لەڕۆڵەی ئەختەری هونەرمەند بدەینەوە، چونکە ئەو

ڕۆڵێکـی مـەزنی لـە سـەرهەڵدانو ئاشـناکردنی هاوولاتیـانی شـارەکە بەهونـەری کـوردی گێـراوە، دیوەخانەکـەی هەمیـشە گەشاوەبوو، لە سەردەمی ئەودا گۆرانیو مەقام بە هـەنگاوێکی خێرا چووە پێشەوە بەستەو ئاوازی کۆنی کۆیە ژیاندەوە، ئەو کـۆڕو ئاهەنگانـەی لـە دیوەخانەکەیـدا سازدەکرا، وەکـو وانـەی ڕاهێنـان وابـوون.. سـەرەڕای ئـەوەی سـەلیقەی ئاوازدانـانی هەبوو، شـاعیرێکی بەئـەزموونیش بـوو ، بۆیـە دەبیـنین هەنـدێك لـە شـیعرەکانی خـۆی دەکـرد بـە مـەقام ، یـاخود بەسـتە ، گـۆرانی(شـلە و خـان) نمونەیـەکی هـەرە بەرزی داهێنـانی ئـەو هونەرمەنـدە شـاعیرەیە، ئـەو بناغـە پتـەوەی ئـەم هونەرمەنـدە دایرێـژا ئـەنجامو بەرهـەمێکی گـەورەی بەدەسـتەوە دا، ئـەویش (تیپـی مـوزیکی بـاواجی کۆیـە) بـوو، لێـرەدا بـە بۆنـەی تێپـەڕبوونی نیـو سـەدە بەسـەر دامەزرانـدنی دا، تیـشکێك دەخەینە سەر قۆناغەکانی سەرهەڵدان و گەشەکردنی.

((گەڕانەوە بۆبنچینە))

لـە ڕۆژی دامەزراندنیـەوە، تـا ئـەم سـاتە وەختـەش تیپـی مـوزیکی بـاواجی خزمـەتێکی بێوچـانی بـە هونـەری کـوردی بەگشتیو ناوچـەی کۆیـە بەتایبـەتی کـردووە، لـە دوای تیپـی مـوزیکی مەولـەوی بـەدوەم تیپـی مـوزیکی کـوردی دێـت لـە

کوردستانی عێراق، لە زۆر ڤیستیڤاڵو بۆنە نەتەوەیەکاندا حوزووریان هەبووە، دەیان تێکستی فۆلکلۆری دوای پوختەکردنو بەهارمۆنیو دابەشکردنی نوێوە خستەسەر خەرمانەی هونەری کوردیەوە، دوای ئەوەی مامۆستا باکوری لە ساڵی ١٩٥٧(دار المعلمین)ی تەواوکرد، لە ناوەندی کۆیە دامەزرا ، ئەوە دەرفەتێکی زێڕینی بۆ نابراو ڕەخساند بۆ دامەزراندنی تیپی موزیك لە کۆیە، ئەو بیرۆکەیە چووە بواری پراکتیکەوە کاتێك ژمارەیەك لە وقوتابیانەی خولیاو ئارەزوی موزیکیان هەبوو، دوای دەوام ڕاهێنانیان دەکرد، لە سەر دەستی مامۆستا باکوری بە ئامێرەکانی عودو کەمانجەو نەی

هەر سەبارەت بەدامەزراندنی تیپی موزیکی باواجی مامۆستا زاهیر محمەد لە گۆشە نیگای خۆیەوە دەڕوانێتە ئەو ڕووداوە، بەبۆچوونی ئەوبێ ، ئەو تیپە موزیکیەی مامۆستا باکوری دایمەزراند، هیچ سیفەتێکی ڕەسمی نەبوو، چونکە دوای ساڵێك پرۆڤە کردنو هەوڵدان هەموو قوتابیەکانپەرتەوازە بوون، کە لە ئەنجامدا تیپەکە هیچ وجودێکی نەماو کۆتای هات، دوای دوانزە ساڵ لەو ڕووداوە ئینجا تیپی موزیکی باواجی نویو سەردەم پاشان ناوبانگی دەرکرد دامەزرا، بە بۆچونی مامۆستا زاهیر دوبارە ناولێنانی تیپە موزیکیەکە بەناوی(باواجی) هەڵەیەکی مێژوویی بوو،

ئەگەر دەوكات هەرناوێكی ترمان بۆ تیپەكە هەڵبژاردایە وەكو ..چناروك، حەماموك، دڵدار.. یا هەر ناوێكی تر ئەوكاتە ناوی باواجی لە ئارادا نەدەما، تەنانەت هەرباسیش نەدەكرا، جێی خۆیەتی لەم دەرفەتەدا ناوی ئەو كەسایەتیانە تۆمار بكەین، كەبۆ یەكەم جار شەرەفی بەشداریبونیان لە دامەزرانیدا هەبووە.

١-مامۆستا زاهیر ٢- سەردار ئەحمەد عەبدوڵلا ٣- ئەنوەر تیر خدر ٤- جانا تۆماس جانا ٥- وریا ئەحمەد عەبدوڵلا ٦- سیامەند عزەت تاهیر ٧- فواد سەعید ئەحمەد ٨- عەتەڵلا حەنا عبدالكریم

٩- ئسماعیل مستەفا قادر.

بە درێژای تەمەنی پرشكۆی ئەو تیپە بەرهەمی ئێجگار خۆش و ئاوازەی پێشكەشی بینەر و گوێگری كورد كردووە ، زۆر بەدڵسۆزیەوە بەڕوحێكی تەڕی كوردانەوە پەیامی ڕەسەنی كوردیان بە خەڵك گەیاندووە، لە یەكەم ڤیستیڤاڵی هونەری كوردی كە لە شوباتی ١٩٧٤ لە بەغدا بەسترا، لە ناو سەرجەم تیپە موزیكەكانی كوردستان پلەی یەكەمی بەدەستهێنا هەر لەبەر ئەو ئاستە بەرزە تیپەكە بوو، مامۆستای مەقاماتی كوردی (عەلە مەردان) لە یەكێك لە دیدارەكانی كە لەگەڵ ڕادیۆی دوردی بەغدا لە ساڵی ١٩٧٦ ئەنجامی دابوو، ئەو تیپە

بە چاكترین تیپ لە كوردستان لە قەڵەم دا، ئێستا دوای بەسەرچوونی ئەو تەمەنە پڕ بەخشش و دوورو درێژەدا بەچاوێكی ڕەخنەگرانە سەرەنج لە چالاكیو كارەكانی ئەو تیپە بدەینەوە لە ڕووی چەندایەتیو چۆنایەتیەوە بەتایبەتی لەم دەساڵە دواییيدا، ئەو تیپە دەكەوێتە بەردەم پرسیارو تێڕامانەوە؟ دەبینین تیپەكە ئەوكات درەوشاوەتر بوو لە چاو ئەمڕۆدا، دەتوانم بڵێم ئیزافەو داهێنانێكی ئەوتۆی دروست نەكردووە، چونكە ئێستا بەشی هەرە زۆری جموجۆڵەكانی تیپەكە خۆی لە بەشداریكردن لە ئاهەنگ و بۆنە حیزبیەكاندا دەبینێتەوە، كە ئەوەش هەرگیز لەگەڵ سەنگ و شكۆی ڕابردویدا ناگونجێ.

## كورتەیەك لە بارەی ژیانی فەقێیاتی كۆیە

پێش بڵاو بوونەوەی قوتابخانە هاوچەرخەكان، تاكە سەرچاوەی فێربوونی خوێندنەوەو نوسین لە كوردستاندا حوجرەی مزگەوتەكان بوو، لەو ڕۆژەوە ئاینی ئیسلام لەڕێگەی(فتوحاتەوە) هەژموونی بەسەر نیشتمانەكەماندا كرد، گەلی كورد بەدڵو بەگیانو باوڕەوە ئاینە نوێكەی كردە میتۆدو ئەجندای ژیانی خۆیو پارێزگاری لێكردوو قوربانی زۆری لە پێناو داوە، هەموو گوندو شارەكانی ئەم نیشتمانە مزگەوتی

لێدروست کراو مەلای بۆ دانرا، زۆرێك لەماڵەکانی کوردەواری لە ڕووی پێداویستیەوە، کەم و کورتیان هەبوو، بەڵام بەدەگمەن مزگەوتەکان ئەو کێشەیان هەبوو، لەو مزگەوتانەوە دەیان مەلای بەناوبانگ و نوسەرو سەرکردەی لێوەشاوە پێگەیشتن و خزمەتی ئاینی ئیسلامیان کرد. هەر لەم مزگەوتانەی کۆیەوە چەندین مەلاو فەقێ و میرزاو شاعیرو هونەرمەند سەریان هەڵدا لەو ڕوانگەی سەرەوە دەشێ بڵێین مزگەوتو مەلای کورد لە ڕۆژگارێکدا، ڕۆڵی مێژوویان لە ژیانی کۆمەڵایەتی و ڕۆشەنبیری و سیاسی گەلەکەمان گێراوە، بەتایبەتی لە سەدەی بیست و یەك بەولاوە..! خوێندن لە مزگەوتەکان یاخود فەقێیاتی کارێکی هەروا هەرەمەکی و ئاسان نەبوو، گەیشتن بەپلەی مەلایەتی، دەیان کۆسپ و تەگەرەی لە بەردەمدا بوو، بەشێوەیەك فەقێ بەشی هەرە زۆری تەمەنی خۆی لە ورێگایەدا بەسەر دەبرد، سەرەنج لەبلیمەتێکی وەکو(حاجی قادری کۆیی) بدە ئەو لەساڵی ١٨١٦ لە دایك بووە، دوای ئەوەی دەگاتە قۆناغی فەقێیاتی لە هاوینی ساڵی ١٨٥٣ لەگەڵ(مەلا عەبوڵلای جەلی زادە) وەك دوو فەقێ بۆ خوێندن ڕوو لەگوندی شێخ وەتمانی ناوچەی باڵەکایەتی دەکەن، دوای ماوەیەك(حاجی) لە (مەلا عەبوڵلا)ی هاوڕێی جودا دەبێتەوە پاشان بۆ تەواو کردنی خوێندنی مەلایەتی

بەتاقی تەنها بەرەو شارەکانی(سەردەشت و سابلاغ و شنۆ) دەچێت بۆماوەی حەوت ساڵان لەو شارانە بەفەقێیاتی دەسوڕێتەوە..! ئەو کاتە پروگرامەکانی حوجرە تەواو دەکات و قۆناغی فەقێیاتی بەسەرکەوتویەتی دەبڕێ، ئینجا ئیجازەی مەلای دوانزە عیلم وەردەگرێ، لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ، کە(حاجی قادر) چل و شەش ساڵی رەبەق لەتەمەنی خۆی بۆ بەدەستهێنانی ئیجازەی مەلایەتی تەرخان کردوە !!ئەوە بۆپیاوێکی زیرەك و بەتوانای وەکو(حاجی) بەزەمەنێکی قیاسی حساب دەکرێ، ئەی ئەگەر فەقێیەکی تەمبەڵ بیەوێ ئیجازەی مەلایەتی بەدەست بێنێ، چەند ساڵی پێدەچێ!؟ بۆ بەدەست هێنانی ئیجازەی مەلایەتی، زۆربەی فەقێکانی کورد سنووری گوندو شارانیان دەبری، تەنانەت هەندێکیان دەگەیشتنە( سابلاغ و سەمەرقەندو قەندەهارو شام)، بەهۆی ئەو گەران و سورانەوە، ژمارەیەك شارەزای زمانەکانی فارسی تورکی دەبوون، سەرەڕای زمانی عەرەبی، کەزمانی خوێندنەکەیان بوو.. کاتێك بە مێژوو دا دەچینەوە، دەبینین رەگ و ریشەی زۆربەی رابەرو سەرکردەکانی کورد، لە مەلا یاخود شێخەکان بوون. سەرەرای باگراوندی گەلێك لە روناکبیران و شاعیرانی کورد لە وێنەی (قانع و ئەدیب و نالی و بێخودو حاجی و خانی و مەلای گەورەو مەحوی و هەژارو

هێمن) و دەیانی تر لە حوجرەی مزگەوتەکان بوون..( حاجی) لە نامەیکدا بۆ مەلاعەبوڵڵای هاورێی نوسیوە دەڵێ: (بەبیرت دێ، کەهەر دووکامان فەقێ بووین چوینە باڵەك ، بە پێخواسی نە کەوشمان بوو، نە کاڵەك).

ڕۆژگارێك نزیکەی سێ سەد فەقێ لە مزگەوتەکانی (مەلا جامی و سەرباغ و حەتك و ڕەشەو مەلا ئەسعەد مزگەوتی گەورە) دەرسیان خوێندووە، لەسەر دەستی ماموستایان( جەنابی مەلای گەورە مەلا قادر گۆپتەپەو مەلا عومەری خدرانی و مەلا مەعسوم هەورامی و مەلاحمدامین چۆم حەیدەری) هەروەها لە گوندەکانی دەشتی کۆیە، سەدان فەقێ لە مزگەوتەکانی (ئیلنجاغ و گۆمەشین سێگرتکان و ئۆمەر گومبەت و خرابەو بۆگدو دۆندارو پێبازۆك و کانی کوردە) دەرسی فەقێیاتیان دەخوێند.. خوێندنی فەقێیاتی لە سەردەمی(مەلای گەورە) گەیشتە ئاستێکی بەرز، ئەو زاتە جگە لەوەی پیاوێکی ئاینی پایە بەرز بوو، لە هەمانکاتدا ڕیفۆرمخوازێکی ئاینی و کۆمەڵایەتیش بوو، ئەو لە ڕیزی (محمەد عەبدەو جمال لادین الافغانی) دا بوو، بەڵام داخەکەم کورد بوو، بۆیە جیهانی ئیسلامو عەرەب فەرامۆشیان کرد. هەروەکو چۆن قوتابی لەم رۆژگارەدا، تا خوێندن تەواو دەکات، بە چەند قۆناغ تێپەر دەبێت، بەهەمان شێوەش فەقێش تا

دەبوو بە مەلا بە چەند وێستگەدا ڕەت بووە، بە جیاوازی خوێندنی پڕۆگرامەکان:-

١- سوختە:

منداڵ لەتەمەنی دەساڵییەوە دەچوە حوجرە، لەوێ تەسلیمی فەقێیەکیان دەکرد، لەم قۆناغەدا فێری هەندێ شتی سەرەتایی دەبوو، لە بابەت: هەڵسوکەوتو ڕەفتارو ڕاهاتن لەسەر ژیانی فەقێیاتی.. سوختە ناخۆشترین قۆناغەکانی خوێندن بوو، چونکە ئەرکی زۆری لەسەر بوو دەبوو پانزە کتێب دەربارەی(نحو صرف وبلاغە) بخوێنێو ئەزبەریان بکات، جگە لەم خوێندنەسوختە دەبوایە(راتبە) بۆ خۆیو فەقێکان کۆبکاتەوەو سەراڕی ئاوهێنانو چاڵێنانو ڕێکخستنی ژووری موستەعیدو ئاوبەدەست داکردنی، یەکێك گێرایەوە: جارێکیان بۆ راتبە کۆکردنەوە چوومە ماڵێکەوە لەدەرگام دا کچێکی باڵابەرزو جوان دەرگای کردەوە، پێی گووتوە تف لەو بەژنە بۆ ناچی کاسبیەکی تر بکەی، دەڵێ: ئیستاش کەسەیری ئەو ماڵە دەکەم هەست بەشەرمەزاری دەکەم.

٢- ناسکە موستەعید:

کاتێك فەقێ کتێبی جامی تەواو دەکرد، دەچوو بۆلای مەلایەکی تر لە گوندێکی دیکە لەم قۆناغەدا سوختەیەکی بۆخۆی دیاری دەکردو دەیهێنایە لای خۆی، لەم قۆناغە

پێویست بوو فەقێ ژمارەیەك كتێب لەسەر فەلسەفەو ئادابو ئیعرابو ئیستیقامە بخوێنیو لە بەریان بكات

٣- موستەعیدی ئاخر مادە:

لێرەدا فەقێ دەگەیشتە ئاستو پلەیەكی بەرز ، خۆی لە مەلا بەكەمتر دانەدەنا، بابەتی خوێندنەكەی لەسەر زانستی كەلامو حیكمەتو فەلەكیاتو ریازیات بوو.. بۆ ئیجازە وەرگرتن دەچووە لای مەلایەكی بەناوبانگ دوو ساڵی دەخایاند، لە هەمان ئەو گوندەی بڕوانامەكەی پێدەبەخشرا، یەكێك لە ئامادەبوانی مەجلیسەكە كچێكی خۆی پێشكەش دەكرد، هەرلەوێش گوندێكی بۆ دەستنیشان دەكرا، تا مەلای ئەو گوندە بێت.

٤- مەلای دوانزە عیلم

كەس نیە ئەم ڕستەیەی سەرەوەی نەبیستبێ، كەواتای ئەوەیە ، مەلا لەملوەی خوێندنیدا بە چاكی ئەم زانستانەی خوارەوەی خوێندووەوە پراكتیكی كردووە ، زانستەكانیش ئەمانەن (علم الاداب والمناضرة، علم المعاني والبلاغة، علم الوضع، علم صرف والاشتقاق، علم النحو والاعراب، علم البديع ، علم البيان والا ستيعارات و المجاز، علم اصول الفقة، علم الحديث، علم التفسير، علم الكلام والعقائد، علم الميراث والشريعة).

## جۆرەكانی مەلا

لە بواری پەروەردەدا ئەمڕۆ مامۆستیان ئاستی زانستیو پەروەدەیان وەك یەك نیە، زۆرجار گوتویانە ئەم مامۆستایە زۆر زیرەكە، فلانە مامۆستا وەك پێویست نیە، مەلاكانیش هەر لە كۆنەوە ئاستی زیرەكیو شارەزاییان چۆن یەك نەبووە مەلاكانیش دابەش بوون بەسەر :-

یەكەم مەلای هەرە چاك.. دووەم: مەلای چاك.. سێیەم: كۆلكە مەلا.. چوارەم: گۆلكە مەلا.

## وەلامێكی هێمن بۆ مەلا عوبێد

لە ژمارە (٢٤) مانگنامەی كۆیەی ئازیز بابەتێكم بلاوكردەوە بەناونیشانی (كورتەیەك لە بارەی فەقێیاتی لە كۆیە) هەر لە هەمان مانگنامەدا ، ئەمما لە ژمارەیەكی دواتر كاك مەلا عوبێد نوسینێكی رەخنە ئامێزی لەسەر نوسینەكەی ئێمە بلاوكردەوە. پێدەچێت كاك مەلا عوبێد بە جوانی نوسینەكەی ئێمەی نەخوێندبێتەوە، بۆیە لێرەدا ڕونكردنەوەو باری سەرەنجەكانم سەبارەت بە وەلامەكەی ناوبراو بەم شێوەیە دەخەمە بەردیدی ئەو بەڕێزەو خوێنەران.

سەرەتا لە خاڵی سێیەمی ڕەخنەکانیەوە دەست پێدەکەین ، چونکە وەکو دیارە زیاتر لە شتەکانی دیکە نیگەرانی کردوون..!!

١- پێم خۆشە مەلا عوبێد بزانێ من زانیاریەکانی بابەتەکەم بەهەوەنتە نەنووسیوە ، بەڵکو لە ئامادەکردن و نوسینەوەیاندا پشتم بەچەندین کتێب و سەرچاوە بەستووە ، کە پێدەچێت مەلا عوبێد هەر نەیبینیون ، ئەگینا هەرگیز بەم شێوەیە نەدەپەشۆکا، واتا بابەتەکەی ئێمە دەرئەنجامی کۆشش و ئەزموونی دەیان ساڵەی ژمارەیەك مامۆستای هەڵکەوتووی گەلەکەمانە ، کە هەموو تەمەنیان لە حوجرەکان و خزمەتکردنی مزگەوتەکان بەسەر بردووە ، یەکێك لەو بەرێزانە:(مەلا مەعسوم‌ومەلامحمد عەلیاوەییە)کەلە چلەکانی سەدەی ڕابردوو لەم شارە فەقێ بووەو لەسەر دەستی(مەلا مەعسوم هەورامی) خوێندویەتی و پێگەیشتوە ، ئەو زاتە بەسەرهات و ڕووداوەکانی ڕۆژانی فەقێیاتی خۆی کردۆتە کتێبێك بەناونیشانی (ژیانی فەقێیاتی لە کوردستان لە سەدەی (١٣و١٤)ی کۆچیدا کتێبەکە (دکتۆر فوئادمعسوم) پێشەکیەکی جوان و پوختی بۆ نووسیوە ، کەتێیدا زۆر ستایشی کتێبەکەی کردووە ، مامۆستا عەلیاوەیی سەبارەت

بەجۆرەکانی مەلا لە لاپەڕە (٩٣) ی کتێبەکەیدا مەلاکانی بەم جۆرە پۆلێنکردووە:-

١- مەلای هەرەچاك.

٢- مەلای چاك.

٣- مەلای زیرەك و تێگەیشتوو.

٤- کۆلکەمەلا.

٥- گۆلکە مەلا.

هەر لەهەمان ڕوانگەوە مامۆستا ( عومەر شێخ لەتیف بەرزنجی) سەبارەت بە پلەو پایەی زانایانی ئاینی لە ڕووی زانستیەوە لە کتێبی (ڕەوشی حوجرە) بەم جۆرەی خوارەوە ئەژماریان دەکات:-

١-زانای چاك.

٢- زانای موفتی.

٣- زانای مودەریس.

٤-زانای تەواو.

٥-کۆلکە مەلا

## کۆلکە مەلا.

جگە لەو راستیانەی سەرەوە من ڕووی پرسیارم ئاراستەی (مەلا عوبێد) دەکەم ئایا ئاستی زانیاری هەموو مەلاکان چون یەکە؟ ئایا ئاستی زانیاری و لێوەشاوەیی مامۆستایان مەلا بەشیرو عومەر چنگیانی وەك ئاستی هەندێ مامۆستای ترن ؟!! جگەلەوە ئێمە گەر تەسنیفەکەی مامۆستا عەلیاوەیمیان بەلاوەنا، ئایا ئەو گووتەو دەربڕینانە لە ناو خەڵکدا هەیە ، یاخود نیە ؟ بێگومان هەموومان بە ئەرێ وەڵام دەدەینەوە.. بۆیە نەدەبوو کاك عوبێد نوسینەکەی هەڵچون و دەمار گرژی پێوە بوایە!!!؟ بۆ وەڵام دانەوەی خاڵی دووەمی ڕەخنەکانی کاك عوبێد هەمدیسان پەنا دەبەمەبەر کتێبەکەی مامۆستا(محمەد عەلیاوەی) جەنابی لەلاپەڕە (٢٤) ی کتێبی ناوبراودا دەڵێ: (ئیشی سوختە لە مەدرسە جگە لە خوێندن ئەمانە بوون(چالێنان سوتەمەنی دابینکردن، ئاوهێنان، جێی مامۆستاکەی ڕادەخست و دەقی دەکرد، راتبە هێنان، گۆزە پرکردن بۆ مامۆستاکەی و ئاو بەدەست داکردنی)ئەگەر مەلای گوندی کاری هەبوایە ، دەبوو سوختە بیکات ، لە هەندێك شوێندا دەبوایە سوختە ئاو بۆ ماڵی مامۆستاکەشی بهێنێت و نەدەبوایە بخەوێ ، تامامۆستاکەی دەخەوت و جێی پێدەدا، زۆر جاریش وابوو جوان قاچ و پەنجەکانی مامۆستای دەشێلا،

نەدەبا لە حوجرەی مامۆستاکەیدا بەدەنگی بەرز قسان بکاتو بـە دەنـگ پێبکـەنێت، هــەر لــەبارەی ئەرکــەکانی ســوختە، مامۆستا(حەمـە کـەریم هـەورامی) کـەپتر لـە چل کتێبـی هەمـە جۆری داناوە ، سەبارەت بەکارو ئەرکەکانی سوختە لە حوجرە لـە لاپـەڕە (۳۷۹)ی کتێبـی(مێـژووی پـەروەردەو خوێنـدن لـە حوجرەکـانی کوردســتان) دا دەڵــێ: ئـەو ســوختەیە ووردە ئیشەکانی جێ ڕاخستنو پاکو خاوێنی حوجرەو راتبـە هێنـان نـان ئامـادەکردنو جاروبـاریش ئیـشەکانی مـاڵی مامۆسـتای پێدەکرا، ئێستا داوا لـە خـودی مـەلا عوبێدو خوێنـەری ئـازیز دەکـەم چاو بـەو پەڕەگرافـەی مـەلا عوبێد بخشێنن، کـە دەڵـێ ( ئێمـە خۆمـان سووختـەش بوینو موستـەعیدیش بووین، شتی وامـان نـەکردووەو نـەدیوەو نەبیـستووە) کەواتـە مامۆسـتایان عـەلیاوەیی‌و هـەورامی بوختانیـان بـۆ فـەقێ هەڵبەستووە مـن لێرەدا لەبەرڕۆشـنایی زانیاریـەکانی ئـەو دوو مامۆسـتایە پایـە بڵندە ، گومان لە مەلایەتی کاك عوبێد دەکەم ، چونکە بێگومـان قــسەکانی مامۆســتایان (محەمــەد عــەلیاوەیی و حەمەکــەریم هەورامی) ڕاستیان پێکاوەو هیچ گەردێکیان لەسەر نیـە .... لـە وەلامی خاڵی سێیەمی ڕەخنەکاندا گووتومە (مزگەوت و مەلای کــورد لــە ڕۆژگارێکــدا ڕۆڵــی مێــژوویان گێــڕاوە ، لــە ژیــانی کۆمەڵایـەتی و ڕۆشـەنبیری و سیاسـی گەلەکەمان بەتایبـەت لـە

سەدەی بیست و یەك بەولاوە ، كاتێك بەمێژووشدا دەچینەوە ، دەبینین ڕەگ و ڕیشەی زۆربەی ڕابەرو سەركردەكانی كورد لە مەلا یاخود لە شێخەكان بوون). ئەگەر بەوردی و بەدیقەت ئەو پەیڤە چڕوپڕانەی سەرەوە بخوێنیتەوە . چ پێویستی دەكرد مەلا عوبێد بڵێ: ( حوجرە تاكە سەرچاوە بووە بۆ بیری نەتەوایەتی و نیشتمانپەروەری و وولات پارێزی ، پێشەواو سەركردەی شۆڕشەكانی كوردستانی گەورە مەلاو شێخ و هەڵگرانی پەیامی حوجرە بوون ). باشە ئەوە جوینەوە و دوپاتكردنەوەی قسەكانی ئێمەی نیە؟. كاتێك مەلا عوبێدلە نوسینەكەیدا خوێندن و لە حەجرەكان بە خوێندنی زانكۆ دەچوێنێ ، من لێرەدا ئەو قسەیە دەخەمە ژێر پرسیارەوە ؟ هەمموومان دەزانین خوێندن لە مزگەوتەكان ، ئەو پەڕی مەلایەكی باشی لێهاتۆتە دی ، كەچی خوێندن لە قوتابخانەو زانكۆ هاوچەرخەكاندا دەیان زاناو سەدان بلیمەتی وەكو (ئەنەشتاین و ئەدیسۆن) ی پێگەیاندووە، كە لە سایەی ئەواندا مرۆڤایەتی بەم ڕۆژگارەی ئێستا گەیشتووە ، وانەكانی ناو حوجرە و مزگەوتەكان پەیوەست بوون بە ( قورئان و ژیانی پێغەمبەر(د.خ) و فەرمودەكانی نەحو و صرف و بەلاغەو ئیعراب و میرات و تەفسیرو شەرع و عەقیدەو هتد...) كەچی خوێندن لە زانكۆكاندا بریتە لە فیزیاو كیمیاو ئەندازەو

بایەلۆجی و نوژداری و کۆمپیوتەرو هونەرو وەرزش و هەموو زانستە هاوچەرخەکان ، ئێستا دوای ئەوەی لە خوێندنەوەی هەردوو بابەتەکە بووینەوە دوا لە کاك عوبێد دەکەم بەهێمنی حوکم لەسەر هەردوو بابەتەکە بدات ، کامەیان ڕاستی پێکاوە ، ئایا ئەو سنووری بەزاندووە، یاخود نووسینە بە بەڵگەو زانستیەکەی من؟.

## مەربێنە قەدیشە(شێم حەمەدی دێرێ)و شەڕی هەرمۆتە

ئەم کوردستانە خاکی جوانی و دارستانەکانە.. مێژووەکەی بە فرمێسك و خوێن نوسراوەتەوە، (خانی و گۆران و هێمن) جوانترین هەڵبەستەیان لە بەرۆکی ئەم نیشتمانە بێنازە داوە.

لە سەردەمی تۆفانەکەدا ئەو دەمەی حەزرەتی نوح خۆی و هاوپەیڕەوانی لەسەر پشتی کەشتیەکە گیریان خواردبوو.. لە خودا پاڕایەوەو گوتی﴿ربي إنزلني منزلاً مباركاً﴾ واتا.. خوایا وابکە لە شوێنێکی پیرۆز کەشتیەکەم ئارام بگرێ.. پێدەچێت خوای گەورە لە کوردستانی بە پیرۆزتر دەست نەکوتبێ، بۆیە چیای(ئارارات)ی پێنیشاندا بۆ گیرسانەوەی کەشتیەکە.

ئەم نیشتمانەی کوردان بە درێژایی رۆژگار جێی تەماعی گەلانی دەرو دراوسێ بووە.. هەر جارەی لە بەرگێکدا پەلاماریان داوەو داگیری کردووە، هەر لە هێرشی رۆم و فارس و تورکەکانەوە تا دەگاتە پەلاماری عەرەبەکان.. هاتنی ئەوان زنجیرەیەك شەڕی خوێناوی لە نێوان سوپای داگیرکەرو دانیشتووانی گوندو شارەکان بەرپابوو.

شەڕی هەرمۆتە ئەلقەیەکە لە زنجیرەی ئەو شەڕو پێکدادانانەی ئەو سەردەمە، دیانەکان هاولاتی رەسەنی ئەم نیشتمانەن  بە درێژایی مێژوو خۆشی و ناخۆشیەکانی گەلی کورد بوون، گێرو کێشە بوون.

دوای ئەوەی سوپای عەرەبان گەیشتە کوردستان بەشێك لە هێزەکەیان رووی لە هەرمۆتەو کۆیە کرد.. بە هۆی ئەوەی

ئـەوان ئامـادە نـەبوون دەسـتبەرداری ئاینەکـەی خۆیـان بـن، عەرەبە موسڵمانەکان پەلاماریان داون و شەڕێکی خوێناوی لە نێوان هەردوو لا هەڵگیرساوە.

شێم حەمەدی دێریٚ کە پیاوێکی ناسراوی ناوچەکە بووە، هـەوڵی زۆری داوە ئاگری جەنگ لەم ناوچەیە دووربخاتەوە.. بەڵام بە داخەوە لە پێناوی ئەو ئامانجە پیرۆزە سەر تێدا چوو و ئاواتەکەی نەهاتەدی.. دوای کوژرانی ئەو شەڕێکی سەخت هەڵگیرسا، کە تێیدا سیٚ هەزار کەس لە دانیشتووانی هەرمۆتە بوونە قوربانی و حەوت سەدیشیان لیٚ بەدیل گیراوە، پاشان ئەوانیشیان تیربارانکردوەو دەستیان بەسەر ماڵ و حاڵیشیان داگرتووە.

لـەو بارەیـەوە(مـەلا رەئـوف حـەوێزی) بـە پارچـە شـیعرێك وێنای لایەنێکی بچووکی ئەو شەڕەمان بۆ دەکات:

لەولاش کوردان زۆر بە تەدارەك
هاتنە روو بە ڕووی یارانی دڵپاك
سەحابان دەستیان کرد بە هەڵمەت بردن
لەم لاو لەولا بوو بە تالاٚن کردن
لەناو ئەو دێیە دەنگ بەرز بۆوە
عالەمێکی زۆر خێرا کۆبۆوە
پاش شەڕێکی زۆر تیپی ئەرمەنیان
زۆریان شەهید کرا لە سوپای ئەسحابان
تالاٚنەکەیان هەموو ساندەوە

لەولاش عەبدوڵلا بە تاك مایەوە
دوای جوهدێکی زۆر، مەردی بە ئخلاس
جا شەهیدیان کرد، کوردی خوانەناس

لەو رۆژەوە مەزاری شێم حەمەدی دێریٚ بۆتە هێمای ئاشتیو سونبولی برایەتی نێوان هەردوو ئاینی ئاسمانی(مەسیحیو ئیسلام) ، مەزارگەی لە ساڵی(١٩٨٨) وەکو هەموو شوێنە مێژوویيو پیرۆزەکانی کوردستان کەوتە بەر ڕقی رەشی بەعسیەکانو وێرانیان کرد.. بەلام خۆشبەختانە دوای راپەرینی ئەم شوێنە چەندین جار چاککراوەتەوەو نویٚ کراوەتەوە.

خەوتنی سەربانان لە هاویندا

رۆژگاری زوو هێشتا دەستی مرۆڤ.. جوانی خاوێنی سروشتی نەشێواندبوو، مرۆڤیش بەدەست گەرماوە وەکو ئێستا هەراسان نەببوو.. شەپۆلی خۆڵبارینی عەربستان کوردستانی نەدۆزیبۆوە.. ئەو دەم خەوی سەربان خۆشیو تامو بۆیەکی تایبەتی هەبوو.

هەر لە وەرزی بەهارەوە خەڵك دەچوون بە کەرو بار لە چیاکانی دەوروبەر داریان دەبرِیەوەو دەیان هێنایەوە ماڵەوە.. کاتێکیش ئاوو هەوا گەرم دەهاتو خەوی ژوورەکان قورس دەبوو.. خەڵکەکە پەیتا پەیتا سەردەکەوتنە سەربانەکانەوە،

دوای ئەوەی دارو چرۆ براوەکانیان بە ڕێك و پێکی رادەخست، ئینجا رووەکی شیواشینك کە بە ڕێکی هەیە بەقەد بادەمچەیە.. بەڵام تاڵە، لە کرۆژو فەقێیان و سێنانەوە دەیان هێنا و لەسەر دارو چرۆکان رایاندەخست تا شوێنی خەوتنەکە نەرم بێ، دوایی بە(بەرچیغ) چیغیان لە ئەتراف ئەو دارانە قایم دەکرد هەرچی ماڵە ئاغاو دەوڵەمەندەکانیش بوو، ئەوا تەختەبەندیان دروست دەکردو بە ئەڵقە ڕێز بە یەکیان دەبەستاوە، بۆ ئەوەی بانەکان فێنك ببنەوە هەر لە ئێوارەوە بە ئاو دەیان پرژاند.. بەرلەوەی تیشکە زێڕینەکانی خۆر ماڵئاوایی لە شار بکەن، ژنان شەربە یا خود گۆزەیان پڕ لە ئاو دەکردو لە ئێوارەوە لەسەر ستارەی ماڵانیان دادەنا، بە هۆی کزەبای شەوانەوە ئاوەکە ئەوەندەیتر ساردو سازگار تر دەبوو.. لەزەت و خۆشی ئاو خواردنەوەی درەنگانی شەوان هەرگیز لە شاشەی بیرەوەریەکان ناسڕێتەوە.. کاتێك دەستێکت بە ملی شەربەکەوە دەگرت و بە دەستەکەی تر شەربەکەت هەڵدەگرت.. لەگەڵ قرپە قرپەی هاتنە خوارەوە ئاوەکە بە گەرووی شەربەکەوە ئەو دەم زەنگوڵەی ئاو ڕێچکەی دەبەست بەلامل و سینگدا شۆڕ دەبووەو تێرو پڕ ئاوت دەخواردەوە.

گەلێك جار تابلۆی ئەو دۆشەگ و لێفە قەد کراوانەی سەر ستارەی ماڵان کە ژنان دایاندەنا تا فێنك ببنەوە بەر لە راخستنیان سەرنجی ئەوسا و یادەوەریەکانی دوێنێ ئەوڕۆژێنێ بە تایبەت لەنجەو نیگای کچانی شۆخ و شەنگ کە

لەگـەڵ سـەرکەوتن و هاتنـە خوارەوەیـان حـەزی گـەنجانی گەڕەکیان بەلای خۆیاندا رادەکێشا.

پێم وایە خەوتنی شەوانی ئەو سەردەمە گەلێك خۆشترو تەندروستی تر بوو لە خەوتنی بەر موبەریدەو سپلیت و هتد... کە زۆربەمان بە هۆی ئەو هەوا ناسازەوە لەشمان دوچاری بێتاقەتی و قورسی و تەنانەت هەندێك نەخۆشیش دەبێتەوە.

ئەفسوس بۆ ئەو کاتانەی کە هەر هێندە لەسەر جێگا رادەکشاین.. ئیدی شنە بای شیوی رەزان و کزەبای هەیبەسوڵتان دەیبردینە خەوێکی قوڵ و ئەفسوناویەوە.

### یەك پۆشی لە زانکۆکان و هەندێ مەسەلەی تر

هەمووومان باوەڕمان بەوە هەیە کە زانکۆ ناوەندێکە رۆڵی مەزن دەگێڕێ لە گشت ئاڵ و گۆڕە رۆشنبیری و کۆمەلایەتی و سیاسیەکانی کۆمەڵگادا.

ئەوەی چوبێتە قوتابخانە هەمیشە ئاواتی بەو رۆژە خواستووە رۆژێك دابێ بڕوانامەی یەکێك لە کۆلیژەکان بەدەست بێنێ.. لە رابوردوشدا واتا لەو رۆژگارانەدا کە دکتاتۆریەت وەکو شیرەکەی دیموکراسی هەمیشە بەسەر سەری گەلەکەمانەوە بوو.. ئەو دەم زانکۆ بۆ خوێندکاری کورد وێرای ئەوەی وێستگەیەك بوو بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەیەکی زانستی.. لە هەمان کاتیش دا شوێنێك بوو بۆ خۆگۆش کردن

بە بیری نەتەوایەتی و نیشتمانی و ئاشنا بوون بە رۆشنبیری گشتی و هزری مرۆڤایەتی.

نمونە هەرە زیندووش لەم بوارەدا بڵاوبوونەوەی بیری شۆڕشگێڕی و کوردایەتی لە ناو ریزەکانی بەشێکی زۆری خوێنکارانی کورد لە زانکۆکانی بەغداو موسڵ و سەلاحەدین.. دواتر بەرجەستە بوون و رەنگدانەوەی ئەو بیرو هەستە لە ریزەکانی(هـ.پ.ك) کە لە ئەنجامدا ئاڵوگۆڕێکی چۆنایەتی لە ناو شۆڕشدا هێنا کایەوە، لەو رۆژە سەختانەدا وێڕای جێ بەجێ کردنی ئەرکەکانی رۆژانەیان، خوێندکاران بەدوای سەرچاوەکانی رۆشنبیری دا دەگەران، هەر کاتێك رۆمانێك، یاخود دیوانی شاعیرێك تەنانەت کە قەسیدەیەکی جوانیشیان پێدەگەیشت، چەندین جار ئەم دەست و ئەودەستی پێدەکرا، ئەگەرچی ئەودەم ئاستی بژێوی زۆربەی خێزانەکانی کوردستان نزم بوو، بەڵام بەشی هەرە زۆری قوتابیان و گەنجان، رێژەیەکی زۆری ئەو پارانەی کە وەریان دەگرت لەکەس و کاریان تەرخانیان دەکرد بۆ کرینی کتێب، هەر لەبەر ئەو هۆکارە بوو ئاستی رۆشنبیری و زانستی قوتابیان بەرزتر بوو بە بەراورد لەگەڵ ئاست و جۆری رۆشنبیری نەوەی ئەمرۆ، ئەگەر چیش رەگەزەکانی خۆ رۆشنبیرکردن و پێگەیاندن لەم سەردەمەدا زۆر بەرینترو ئاسانترن لەچاو هەل و مەرجی ئەوێ رۆژێ . لە ئێستادا ئەوەی سەرنجی لە رەوشتی خوێندنی زانکۆکان دابێ بۆی دەردەکەوێت کە کۆمەڵێك کێشەو گرفت رێگرن لەبەر دەم پێشکەوتنی کاروانی پەروەردەو فێرکردن لەو

زانكۆيانەدا يەكێك لەو گرفتانە كە ئێمە لێرەدا مەبەستمانە تیشكێكی بخەینەسەر مەسەلەی ( بالاپۆشی) خوێندارانی زانكۆیە.

هەركەسێك لە ئێمەومانان لەكاتی دەوامی فەرمی دا سەردانی زانكۆی كردبێت، بەر لەهەموو شتێك پۆشینی جل‌و بەرگی خویچندكاران بەتایبەتی هی كچان سەرنجی راكێشاون ئێستا بەهۆی پەیرەو نەكردنی سیستمی یەكپۆشی ( زی موحد ) لەلایەن خوێندكارانەوە گۆرەپانی زانكۆو هۆڵەكانی خوێندنیان زۆر لەسالۆنی نمایشی شێوازەكانی جل‌و بەرگی بێگانە دەچێ

رەنگبێ هەندێ خوێنەر دوای خوێندنەوەی ئەوپەیڤانەی سەرەوە بەكۆنە پەرستم بدەنە قەڵەم، بە پێچەوانەوە من لەگەڵ ئەو پەری پێشكەوتنی زانكۆ دام لە هەموو رووەكانەوە، چونكە ئایندەی گەلەكەمان بەندە بە ئاستی پێشكەوتنی زانكۆكانمانەوە، بەلام پێشكەوتن لەرووی ناوەرۆك‌و گەوهەرەوە بێت نەك لەرووی فۆرم‌و مەسەلە لاوەكیەكانەوە

مانەوەی ئەو دیاردە نێگەتیفە بەو شێوەیەی ئێستا جگە لەوەی زەرەرو زیان بە پرۆسەی پەروەردە دەگەیەنێ كاریگەری‌خراپیشی لەسەر سایكۆلۆجیەت‌و بژێوی ژمارەیەكی زۆر لە خوێندكاران بەجێ دێڵێ !

هەمووشمان ئەو راستیە دەزانن كە زانكۆ شوێنێكی پیرۆزە خویچندكار تێیدا فێری رۆشنبیری هاوچەرخ‌و ژیانی نوێ و میتۆدەكانی ئازادی‌و دیموكراسی‌و ...هتد دەبێ نەك وەكو

ئـەوەی لــە ئێــستادا هەیــە کــە ژمارەیــەکی بەرچــاو لــە خویــچندکاران کێبرکێیانــە لەســەر بەدەســت هیــچنانی پێـشکەوتوو تـرین مۆبایـل و نـوێترین جۆرەکـانی جلو بـەرگی بێگانەو تازەترین ستایلەکانی قژ برینو ماکیاژ کردن



# نووسەر لەچەند دێڕێکدا

* لەساڵی ١٩٥٦ لە دایك بووە

* لەساڵی ١٩٧٨ قۆناغی ئامادەیی تەواو کردووە

* لەساڵی ١٩٨٠ بووە بەفەرمانبەرو هەر لەوساڵەشدا پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە کردووە

* لەساڵی ١٩٨١ وە تا ساڵی ١٩٨٩ پێشمەرگە بووە لە تیپەکانی ٩٣ ی کۆیە و ٨٦ ی دەشتی هەولێر

* لەدوای ڕاپەرینەوە تاکو ئەمرۆ درێژەی بەخەباتی سیاسی داوە لەریزەکانی ی ن ك

* لەساڵی ١٩٨٩ وە خێزانی پێك هێناوە سێ منداڵی هەیە بە ناوەکانی فرمێسك و بیزا و باهۆز

ئێستا بەڕێوەبەری ڕۆشنبیری منداڵانی کۆیەیە

دیمەنێك لەمزگەوتی گەورەی کۆیە





پاشماوەی دیوەخانی مەحمود ئاغا

شاری کۆیە کە لەدوورەوە
قشڵە بەجوانی دیارە





لاوك بێژی بەناوبانگ ( کاوێس ئاغا )

جولەکەکانی کۆیە سانی ١٩٤٢

لەچەپەوە ( ئاحومی صاڵح ، شەلکەی زێرنگر، بنیامین مۆشکە شەمتۆی زێرنگر،زەریفە هاروون بولبول کراوە بەبورك کچی ( شەمتۆ) شەزرە مۆردخای، رەحمین زەریفە حایە سەمحە ساڵحۆك، لەیلا هاروون سیمان ساڵحۆك .





خوالێخۆشبوان : حەمەد ئەمین عەباس و حەمە گەمحان

شەهید قاسملو- بێرنارد کۆشنەر بەڕێز مام جەلال





سێوە لەناو ستۆدیۆی ئێزگەی بەغدا .. بەشی کوردی لەمانگی نیسانی ١٩٥٣ لەکاتی تۆمارکردنی مەقامەکانی بەیارمەتی مۆسیقاژەنەکانی ئێزگە ( احمد الخلیل ) بەعود ( ئایڤن بەهنام ) بەنای ، ( قادر دیلان ) بە کلارنێت ( ئازم نەعیم ) بە کەمانچە ( عبدالاحد جرجیس ) بە قانون



لەمەر کوییەڵە کورد هەبێ تەزبیحی لێیە



یەکێك لە پیشەگەرەکان



قەسری کاکە زیاد



دەبێ ئەم خونچەیە بیر لەچی بکاتەوە !؟

ڕۆژگارو ڕەشەباو پشتگوێی خستە دارەکانی
جوانترین دەروازەی ئەم شارەیان ڕەنگ زەردو کەنەفت کرد

کاتێک وێنە دەدوێ

لەڕاستەوە: ڕێبوار [illegible]، مام هەژار، مەلا دلشاد، سەلین هومەر / گوندی ئیلنجاغ ساڵی ١٩٨٦

ڕۆژگارێك ( کوردستان دروو) پی لەبەرەوەدابوو

تیپی مۆسیقای باراجی









منداڵان لەسەر شانۆ

ئاشی دێرین









ئارامگەی هەیبەسوڵتان لەدامێنی ئەوزنجیرە
چیایەی کە هەر بەناوی ئەم کەسایەتیەوەیا



بەڕێز( حاجی کریم سلیم ) خاوەنی ئەوچایخانەیەی
کە هەر بەناوی خۆی بەناو بانگ بوو



گرتەیەک لە ئاهەنگی نەورۆزی کۆیە لە ساڵی ١٩٦١



مستەفائیبراهیم ناسراو بە ( مچە سوسکە )



مەلیکە گچکە، فەیصەڵی دووەم کەلە شۆرشی
ساڵی ١٩٥٨ بەخۆی و بنەماڵەکەیەوە کوژران





( دڵدار ) خاوەنی شیعری
مارسیلیزی کوردن ( ئەی رەقیب )





خوالێخۆشبوو ( مەعروف چیاوك )



کەنیسەیەکی کۆیە



یەکێك لەپیشەگەریەکانی کۆیە

شاعیری نەتەوەی کورد ( حاجی قادر )





مێژوو نوس ( مامۆستا تاهیر ئەحمەد حەوێزی )



سیاسەتمەدارو مامۆستای پارتیزانی شۆڕش
(شەهید دکتۆر خالید )



زانای کۆمەڵ ناس و دۆستی
گەلەکەمان بەڕێز ( ئیسماعیل بێشکچی )

